# گفتوگۆکان



بەختیار عەلی
ریبین هەردی
د. سەباح بەرزنجی
د. ئەلبیرت عیسا
د. شاهۆ سەعید

## شوان ئەحمەد

بەرگی یەکەم

# گفتوگۆکان


- ئامادەکردنی: شوان ئەحمەد
- بابەت: دیالۆگ
- پیتچنی: ئامادەکار
- هەڵەچنی: کارزان عەبدوڵلا
- نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: ئەکرەم محەمەد ئەمین
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلا
- قەبارەی کتێب: ½ A٤
- ژمارەی لاپەڕە:٢١٢
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩١٢)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- ...کەمال
- [illegible]
- ژمارەی سپاردنی (٢٦٨١)ی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.





**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**

**گردی ئەندازیاران/ ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤**

# پێڕست

## پێشەکی...

ئـەم گفتوگۆیانـەی لێـرەدا دەیانخوێنێتـەوە، بەرهـەمی سـەروەختی کارکردنمە لە هەفتەنامەی (هاوڵاتی).... کـۆی ئـەم دیدارانـە بـەو نیـازە سازکران تا لەوێـدا بڵاوببنـەوە، بـەڵام لەبـەر دووورودرێـژی، هەنـدێکیان چانسی بڵاوکردنەوەیان وەکو پێویست نـەبوو. لـەو کاتەشـەوە تـا ئێسـتا لەسەر ئەم کارە بەردەوامم، واتە ئەوە بـۆ مـن بـوو بـە پـڕۆژەی کـارێکی دوورودرێژ و ژمارەی ئەوانەی من دامنابوون بۆ ئەم کـارە، ڕۆژ بـەڕۆژ لـە زیادبووندا بوون.... هەموو ئەمانە وایان لێکردم بەچەند بەشـێك بـیر لـە بڵاوکردنەوەیان بکەمەوە.

ئەوانەی هێناومەتە قسە، کەسانێکن لە کایەی ڕۆشنبیری و کوردیدا، دیارن و شوێن دەستیان لەسەر واقیعی ڕۆشنبیری ئێمـە دیـارە. ڕۆشـنبیری کوردی بـە بـەراورد بـە ڕۆشـنبیرییە زینـدووەکانی دنیـا و دەوروبـەرمان، ڕۆشنبیرییەکی فەقیرە، بەڵام فەقیرترین بواری، بواری گفتوگـۆ و دیالۆگـە. هەتا ئێستا لای ئێمە دیالۆگکردن و دوانـدنی ئـەهلی قەڵـەم، نەبووەتـە

دیـارده و نـەریتێك و شـتێکه تـا ئـەمڕۆش ڕۆشـنبیری کـوردی بەهێنـد وەرینەگرتووە.

لەکاتێکدا ڕۆشنبیرییه زیندووەکانی دنیا، پڕیەتی لەو کتێبانـەی لـه بەرگەوە بۆ بـەرگ تەرخانـه بـۆ دوانـدنی ڕۆشـنبیران و ئـەهلی قەڵـەم... گرنگییەکی دواندنی ڕۆشنبیران، زیاتر ئاشنابوونه بەو بیروبۆچوونانەی لای خوێنەران ئاشکرانین و ڕوونکردنەوەی ئەو چەمك و زاراوانەشه که له وتـار و نووسینەکانیدا بەکاری دێنن، هاوکات بەشێکی تریشی بەو مەبەستەیه که لەسەر ڕووداوە هەنووکەیی و ڕۆژانەکان، ڕاو سەرنجی ئەوان بزانین.

٢٠٠٤/١٢/١٠

سلێمانی

# دەربارەی ئیسلامیی سیاسی

## بەختیار عەلی

**شوان ئەحمەد:** کولتووری ئێمە بە ئاراستەی شکاندنی حورمەتی ژیان و ونکردنی بەهای مرۆڤ کار دەکات، ئەو شەڕە خوێناوی و هەرا بەردەوامانەی ڕۆژانە لە بەردەرگای ماڵەکانمان ڕوودەدەن، دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو کولتوورە مەرگدۆستەیە... مەبەستمە بڵێم بۆ دەرچوون لەم واقیعە دۆزەخییە، پێت وانییە ئەرکی سەرەکی و کاری جدی ڕەخنەکردنی سەرتاپا ئەو کلتوورە بێت، نەوەك شتێکی دی؟

**بەختیار عەلی:** بەوەدا کولتوور لە بێشومار دیادە و بێشومار دەرکەوتە دروست دەبێت، ستراتیژێکی زۆر ئاڵۆزمان پێویستە بۆ ڕەخنەکردنی، کە دەکرێت لەسەر ئاستێکی زۆر جیاجیا پۆلێنی بکەین. پرۆژەی ڕەخنە لە دونیای ئێمەدا تاکە پرۆژەیەکە کە دەبێت پێش هەر

پرۆژەیەکی دی بکەویت، بەبێ ڕەخنە نە ڕابردوومان هەیە و نە داهاتوو، نە ڕۆشنبیری هەیە و نە شارستانییەت، بەڵام ئەم پرۆژەیە لە چەند ئاستێکی سەرەکیدا گەڵاڵە دەبێت. ئەم ئاستانەش هەمووی گرێدراوی یەکن و وەك کۆمەڵێك ئەڵقەی ئۆرگانی کار دەکەن.

یەکەم: ڕەخنەگرتن لە ڕابردووی دوور، بە هەموو کەلەپوورە ئایینی و میتۆلۆژییەکەیەوە.

دووەم: ڕەخنەگرتن لە ڕابردووی ئەم ستراکتورە کۆمەڵایەتی و سیاسیەی ئەمڕۆ باڵادەستە. واتە گەڕان لە مەغزای ئەو گۆڕانکارییانەی لە سەدەی بیستدا ڕوویان دا، لە ڕیشەی ئەو پێکهات و ستراکتورە نوێیانەی لەم سەدەیەدا دەرکەوتن، وەك حیزب و ئایدیۆلۆژیا سیاسییەکان و دەزگا ڕۆشنبیرییەکان و وەزیفەی ڕۆژنامە و وەزیفەی هەندێ دەزگای زانستی. ئەو شێوازییە گەورەیەی ئێمە ئەمڕۆ تیا دەژین، بەرەنجامی ئەو بناغە هەڵە و دژوارەیە کە بنەماکانی لە سەدەی بیستدایە... سەدەی بیست سەدەی هەڵە گەورەکانی ئێمەیە، سەدەی دەسپێکردنی هەڵەکانە.

سێیەم: ڕەخنەگرتن لە میکانیزمی وەرگرتن و دانەوەی فیکر، کە لای من گرنگترین و خەتارناکترین ئاستەکانی ئیشکردنی فیکرە لە دونیای ئێمەدا. ئەمە ئەو ئاستەشە کە بۆ خۆم لە هەر تەوەرەیەکی دیکەی ڕەخنە، زیاتر کارم تیاکردووە و هەرێمی دڵخوازی منە. لەژێر ئەم تەوەرەدا ڕەخنەگرتن لە ناسیۆنالیزم و مارکسیزم و ئیسلامی سیاسی بەرقەرار دەبێت. کە سێ ئایدیای دەرەکین و لە دنیای ئێمەدا لە ڕووی فیکرییەوە، لە نزمترین ئاستی ئیشکردنی خۆیاندان و لە ڕووی چالاکی و ئامادەگی

سیاسییەوە، ڕێگری یەکەم بوون لەپێش لەدایکبوونی فیکرێکی تیۆری کە لەسەر واقیعی کوردی ئیش بکات و ئێستاش بەردەوامن.

دیارە کە دەڵێم دەرکین هەرگیز بەو مانایە نییە کە سەرەتا فیکرییەکانی ئێمە نابێت یان ناشبێت دەرەکی بێت، بەڵام بەو مانایە کە فیکری دەرەکی هێزی بزواندنی فیکر بێت بۆ تێڕمان لە دونیای خۆت. گەر بیرت بێت من لە سەرەتای دەسپێکردنمەوە، لە هەمان ئەو وتارەوە کە تۆ لە سەرەوە ئاماژەت پێدا، باسم لەوە کرد کە لە دونیای ئێمەدا فیکری دەرەوە کە دێت دەبێت لە پێناوی ئەوەدا بێت ببێتە بزوێنەری بابەتە خەوێنراوەکانی ناوخۆ. ببێتە کۆمەك لە بینینی ئەو لایەنە خنکێنراوانەدا کە دەبێت ئێمە لەسەریان بدوێین. ئەوانەی کە ئەمڕۆ من و کۆمەڵێ نووسەری تر بەوە تاوانبار دەکەن کە لە دەرەوە شت دەهێنن، بەشێوەیەی ناشیرین یارییەکە هەڵدەگێڕنەوە و ملی ڕاستییەکان دەشکێنن. لە ساتێکدا مارکسی و ناسیۆنالی و ئاینییەکانی کورد، بێپەروا پشت دەکەنە واقیعی کوردی و خوێندنەوەی ئەو واقیعە و مۆدێلێکی کۆپێکراوی ناسیۆنالیزم و ئاین و مارکسیزم دەخەنەڕوو، بێئەوەی توانایان هەبێت هەتا ڕۆشنبیرێکیش بەرهەمبهێنن، نەوەك داهێنانی (ابداع) لەو ئاستانەدا کردبێت، بەڵکو توانای شەرحکردنی چەمکە سادەکانیشی هەبێت، لەم ئاستەدا جیاوازی مامەڵەکردنەکان دەردەکەون. لە سەرێکەوە ستراکتورێکی سەلەفییت هەیە فیکری دەرەوە دەهێنێت بۆ ئەوەی بیکاتە ئەڵتەرناتیڤێکی لەدایکبوونی فیکر لە ناوەوە، لە سەرێکی دیکەشەوە کۆمەڵێك ڕۆشنبیرت هەیە فیکری دەرەوە دەهێنن بۆ ئەوەی بیکەنە بزوێنی

لەدایکبونی فیکر لە ناوەوە، بیکەنە هۆی بینین و یاریدەدەری گەیشتن بەو کونج و کەلەبەرە تاریکانەی دەیان ساڵە دەچەپێنرێن و دەکرێن بەژێرەوە.

چوارەم: ڕەخنەگرتن لە ئەخلاقی کۆمەڵایەتی ئێمە. کە لەژێر ئەم تەوەرەدا دەکرێت ژمارەیەك کێشەی گرنگ تاوتویێ بکرێت، وەك: (کێشەی جنس، کێشەی ئافرەت، کێشەی توندوتیژی، کێشەی پەیوەندی نێوان نەوەکان... هتد).

پێنجەم: ڕەخنەگرتن لە دیدی ئێمە بۆ چەمکگەلی دادپەروەری و دیموکراسی، لەژێر ئەم تەوەرەدا. ڕەخنەگرتن لە پێکهاتی ئابووری و سروشتی نوخبە کۆمەڵایەتییەکان و نوخبە سیاسییەکان ڕادەوەستێت. واتە خوێندنەوەی میکانیزمی حوکمکردن و دابەشکردنی سەروەتی کۆمەڵایەتی و ئەو فۆرمە ئابووری و سیاسییەی بەخۆیەوە گرتووە، کە لێرەدا دەکرێت ڕۆشنبیرانی چەپ تەواو چالاکبن و سوودی گرنگ بە فیکری ئێمە بگەیەنن.

شەشەم: ڕەخنەی دیاردەگەرایانە... واتە خوێندنەوەی ئەو دیاردانەی دەکەونە نێوان ئەو تەوەرانە و بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندییان بە هەموو بوارەکانەوە هەیە. بۆ نموونە دیاردەیەکی وەك کۆچ یان مەرگدۆستی بەتەنیا بەیەك کایە و یەك شێوە ڕەخنە تەفسیر ناکرێت. دیاردەیەکە خاڵی یەکدی بڕینی، هێڵی مێژوویی و دەروونی و سیاسی و ئابووری و ئەخلاقی و زهنییە. چی دەردەچێت گەر تەفسیرێکی کاریکاتێریمان هەبێت کە ناتوانێت ئاڵۆزیی ناو دیاردەکە ببینێت... ڕەخنەی دیاردەگەرایانە لێرەدا بە مانای ڕەخنەی فینۆمینۆلۆژی نییە،

بەڵکو بەمانای ڕەخنەکردنی ئەو دیاردانەیە کە زیاد لە ئاستێکی ژیان دەبڕن و بە زیاد لە پەتێکەوە بەستراون و دەچنەوە سەر زیاد لە سەرچاوەیەك.

بێگومان ڕەخنەی کولتوور لە کۆی ئەو ڕەخنانە دروست دەبێت، چونکە خودی کولتوور لە کۆی ئەو دیاردانە دروست دەبێت. کولتوور خۆی زەمینە یەکخەرە بۆ کۆمەڵێك بواری جیاوازی ژیان لەناو یەك بۆتەدا، لێرەوە ڕەخنەکردنی بە گەلەك ڕێگا و دەروازەی جۆراوجۆردا تێدەپەڕێت. گەر لە ڕۆشنبیری ئێمەشدا تێگەیشتین لەم ڕاستییە سادەیە بەرقەراربایە، گەلەك سەر ئێشەمان لە کۆڵ دەبووەوە. لە ڕاستیدا ڕەخنەکردنی کولتوور، واتە پیادەکردنی ڕەخنەیەکی سەرتاسەری ژیان.

**شوان ئەحمەد: لە دوای ڕاپەڕینەوە زیاد لە دیاردەیەك هاتووەتە ناو واقیعی ئێمەوە، ڕەنگە دیارترین دیاردەیەك (ئیسلامی سیاسی) بێت. سەبارەت بەدروستبوون و گەورەبوونی قەوارەی ئەم گروهانە، لە واقیعی داوەشاوی ئێمەدا لەمڕۆی کوردستاندا دەڵێیت چی؟**

**بەختیاری عەلی:** پێموایە ئایین و سیاسەت تا ئەندازەیەکی زۆر لە پەیوەندییەکی هەمیشەییدا بوون، هیچیان بێئەوەی دیکەیان نەژیاوە. هەردوو پرۆسەکەش بە ئەندازەی یەکتر لەسەر ئازادی مەترسییان هەیە. چ ئایین خۆی بکاتە سیاسەت، چ سیاسەت خۆی بکاتە ئایین، دواجار هەردووکیان یەك پرۆسەن. تاکە جیاوازییەك هەبێت ئەوەیە ئایینییەکان ئەوە ناشارنەوە کە ئایین دەبێت بکرێتە سیاسەت و ئەوە بە ئاشکرا دەکەنە

مەنهەجی خۆیان، بەڵام ئایدیۆلۆژیاکانی تر کاتێك خۆیان دەکەنە ئایین، ناوی دیکە بۆ ئەو پرۆسەیە دەدۆزنەوە و حاشا لە مانا جەوهەرییەکانی دەکەن. دیارە هۆکار زۆرە کە یاریدەی گەشەی ئیسلامی سیاسی داوە. لێرەدا من لەسەر یەك خاڵی سەرەکییان دەوەستم. ئەوەش ڕیشەکانی پێکهاتنی سیاسی ئێمەیە لەناو ئاییندا. ئەوەی کە یارمەتی ئیسلامی سیاسی دەدات، ئەوەیە کە (سیاسەتی ئایینی) واتە سیاسەتکردن بە هەمان هزری مومارەسەکردنی ئایینەوە، تەمەنێکی پێشتر و کۆنتری لە ئیسلامی سیاسی هەیە. واتە ئیسلامی سیاسی تا ئەندازەیەکی زۆر، شێوەیەك لە شێوەکانی بە ئایینیکردنی سیاسەتە نەوەك تاك شێوەی بێت. هەموو حیزبە سیاسییەکانی کوردستان، ئیدی لە حیزبی شیوعییەوە بیگرە تا پارتی دیموکرات و تا یەکێتیی نیشتمانی، مێژووی تایبەتی خۆیان، سومبولی ئایینی خۆیان و ڕیتولی ئایینی خۆشیان هەیە. دەکرێت لەسەر هەریەکێك لەم حیزبانە و شێوەی (خۆئایینناندنیان) لێکۆڵینەوەی قەشەنگ و سەرنجڕاکێش بنووسرێت. حیزبە بچووکەکانیش ئەمڕۆ هەمان ڕیتواڵ بەزەقتر کۆمیدیتر پیادەکەن. سەدەی بیست، سەدەی هەلێك بوو بۆ ئازادکردن یان کەمکردنەوەی جەبری تیرۆانین و نیگاسالاری ئایین لەسەر سیاسەت، بەڵام دواجار ئەو پرۆسەیە لەبەر زنجیرەیەك هۆی گەورە نووشوستی هێنا. لێرەوە لە وڵاتی ئێمەدا سیاسەت بە ڕوخساری ئایینەوە ئیش دەکات. کە لێرەدا بە کورتی چەند تەوەرێکی ئەو لێکچوونانە دەستنیشان دەکەم:

١- كاركتەری سەرکردەی سیاسی لە کاراکتەری زەعیمی ئایینی جودا نەبووەتەوە و لـە شـوێنگەی ڕەمـزی کۆمەڵایەتیـدا هـەمان جێـی داگـیر کردووە.

٢- لۆژیکی تەکفیرکردن لە سیاسەت و لە ئاییندا هەمان لۆژیکە.

٣- سیستمی پیرۆزیی و جیاکردنەوەی حەرام و حەڵاڵ، لەنێوان ئـایین و سیاسەتدا هاوبەشە.

٤- چەمکی حەقیقەت لە ئایین و سیاسەتدا وەك یەکن، هـەردووکیان دوو چەمکن لە موتڵەقدا کۆتاییان دێت.

٥- تێگەیشتن لە خەباتی سیاسی تا ئەمڕۆ ڕەهەندێکی ئایینی هەیە. چەمکی خەبات و چەمکی جیهاد یەك شتن. خەباتی سیاسی تائێسـتا لـە سروشتی لە جیهادی ئایینی پاك نەبووەتەوە.

دیـارە دەکرێـت ئـەو خاڵانـە بێشـومار زیـاد بکـەین، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـتمە ئامـاژە بـەوە بـدەم کـە سـەرکەوتنی ئیسـلامی سیاسـی و تەشەنەکردنی دەگەڕێتەوە بۆ خودی پێکهاتی سیاسی ئێمە. سیاسەت لـە وڵاتی ئێمەدا هەرگیز لە ئایین جیا نەبووەتەوە. ئەوەی کە پێـی دەگوترێـت عەلمانییەت، درۆیەکی گەورەیە... لێرەوە کە ئیسلامی سیاسی دێت، دێتـە سەر زەمینێکی ئامـادە. دێتـە سـەر زەمینێـك پـێش خـۆی ڕەگـەزەکانی پێکۆلکراون.

ئیسلامییەکان کـە دەگەڕێنـەوە پـەردە لەسـەر ئـەو وەهمـە لابـدەن، جارێکی دی بە ئاشکرا و بێ پەردە سیاسەت و ئایین پێکەوە گرێدەدەنەوە، پڕۆسەیەك کە پارتە سیاسییەکانی تر لەژێرەوە پەروەردەی دەکەن. کێشـەی

سەرەکی لە دیدی مندا ئەوە نییە ئیسلامی سیاسی هەیە، بەڵکو ئەوەیە ئیسلامی سیاسی بتوانێت کار لەسەر گوتاری کۆی حیزبە سیاسییەکانی تر بکات... ئەمڕۆ کاریگەری ئیسلامی سیاسی لەسەر حیزبە کوردییەکان، کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیە. سەرکەوتنی ئیسلامی سیاسی بەوە ناپێورێت خۆی چەند چەکدار و چەند ئەندامی هەیە، بەڵکو بەوە دەپێورێت چەندە دەتوانێت حیزبەکانی دی لە مەوقعییەتی ئیسلامی یان ئایینی نزیك بکاتەوە.

ئیسلامییەکان توانیویانە زمانی سەرکردەکانی کورد بگۆڕن و ناچاریان بکەن بە زمانی ئەوان قسە بۆ خەڵکی بکەن. مەترسی گەورە ئەوەیە لە زاری سیاسییەکانی ترەوە، هەمان گوتاری ئیسلامی سیاسی ببینینەوە. وشەگەلی وەك "خوارج"، "جند الاسلام"، "جند الکفر" کە ئەمڕۆ گوێمان لێی دەبێت، هەر هەمان وشەگەلی ناو فەرهەنگی ئیسلامییەکان خۆیانە. ئەوەی ئێستا تیا دەژین، شەڕی نێوان دوو شێوە مومارەسەکردنی ئایینییانەی سیاسەتە. یەکێکیان سیاسەت بەو جۆرە پیادە دەکات وەك ئەوەی لە کتێبە ئایینییەکاندا هاتووە، ئەویدیان ئایین وەك زمان، ڕیتوال، پاشخانی هزر، فەزای ئیشکردن و (ولاو) بەکار دەهێنێت. بەداخەوە شەڕ لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەنێوان دوو جۆرە دیدی ئایینیدایە بۆ سیاسەت، گەر سەرنج بدەیت وتاری سیاسییەکانی یەکێتیی نیشتمانی و پارتی کەمتر ئایینی نییە لە گوتاری ئیسلامییەکان.

من باوەڕێکی تایبەتم هەیە، پێموایە هەر کۆمەڵگایەك لە دۆخی جەنگ و پێکدادانی ناوەکی و دەرەکیدا بژی، هەوێنی گەشەکردن و

کارکردنی ئایین تیا بەهێزترە. جەنگ خزمەتێکی گەورە بە گەشەی ئاڕاستە ئایینییە توندڕەوەکان دەکات، جەنگ تاکە کەش و هەوایەکە بوار بۆ ئیشکردنی زاراوە سیاسییەکانی ناو دین خۆش دەکات. چەمکگەلی وەك جیهاد و شەهادەت لە کەش و هەوای شەڕدا گەورە دەبن و دەبنە چەمکی موگناتیسی بەهێز، دەبنە چەمکگەلێك سەربەخۆییەکی تایبەت لە کۆی پێکهاتەی سیاسی وەردەگرن و لە دەرەوەی ئەو سیاقە، دەبنە زاراوەگەلێکی ئازاد کە بۆ خۆیان لە دەرەوەی هەر جڵەوکارییەك ئامانج و کارکردی خۆیان لە هەر ئامانج و کارکردێکی دی جیادەکەنەوە. لە کەش و هەوای شەڕدا ئامادەگی کۆمەڵگا بۆ قبوڵکردنی زاراوەگەلی وەك جیهاد و شەهادەت ئاسانترە، واتە زەینی کۆمەڵایەتی بۆ وەرگرتنی ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە مانای (ململانێ) و (مردن) خەملیوترە. ڕەنگە دراوە مێژووییەکان پتر پشتگیری ئەو تێزەیە بکەن، شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران پایەکانی خۆی لە شەڕی عێراق- ئێراندا قایم کرد. حیزبوڵڵای لوبنان لە شەڕدا دژ بە ئیسرائیل شوناسی خۆی داڕشت، تاڵیبان بەرهەمی فەزایەکی دووردرێژی جەنگە. کەرەستە سیحراوییەکانی ئیسلامی توندڕەو، تەنیا لە شەڕدا مانای خۆی وەردەگرێت و دەچەسپێت. ئیسلامی توندڕەویش لە کوردستان لەو هاوکێشەیە جیا نابێتەوە. گەورەترین هەڵە ئەوەیە پێتوابێت بە جەنگ دەتوانیت بەسەر توندڕەویی ئایینیدا زاڵبیت... جەنگ، نیشتمانی گەشەکردنی چەمکە سیاسییەکان و مانا سیاسییەکانی زاراوە دینییەکانە. من تەنیا دوو ستراتیژ شك دەبەم بۆ بەرگرتن لە گەشەی توندڕەویی دینی:

١- بەرگرتن لە گۆڕینی سیاسەت بۆ دین، تاکە ڕێگرە لەبەردەم گۆڕینی دیندا بۆ سیاسەت. کە تۆ سیاسەتت نەگۆڕی بۆ دین، سەرۆکی حیزب نەبوو بەو کارەکتەرە خورافییەی هیچ ڕۆحلەبەرێکی تر نەتوانێت قسە لە قسەیدا بکات و جێگای بگرێتەوە. حیزب نەبووە ئەو جەستە موبارەکەی لە سەروو یاسا و کۆمەڵگاوە بێت، ئەوکات دینی سیاسەتبازیش بە ئاسانی موقەدەسەکانی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا ناسەپێنێت.

حیزبێك هەموو میکانیزمە دینییەکانی لەخۆگرتووە، سەرۆکەکانی خۆیان لە پلەوپایەی بەشەردا نابیننەوە و هەموویان (سەرۆك مدی الحیاە)ن. لەسەر سستمی پیرۆز (مقدس)/ چەپەڵ (ملوث) کار دەکەن، بە نەزمی جیهاد و شەهادەت پێشمەرگەکانیان گۆش دەکەن... ئەم جۆرە حیزبە تەنیا لەبەرئەوەی ناوی ئیسلامی بەخۆیەوە نەناوە، مانای ئەوە نییە ئیسلامی نییە. ئیسلامییەت ستراکتورە نەوەك ناو، مۆراڵێکی تایبەتییە نەوەك بەرنامەیەکی سیاسی. گۆڕینی خەلیفەکان جاران لە گۆڕینی سەرۆك حیزبەکان و هەندێ ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزبەکانی ئێستای کوردستان ئاسانترە بووە. ئەی ئەمەیان ئایین نییە چییە؟ ئەوەی پێتوابێت ڕزگارکەرێك لە دەرەوە دێت و تۆ لە دێوە دزێوەکانی ناو مێژووی خۆت ڕزگار دەکات، ئایین نییە چییە؟

لە هەر کۆمەڵگایەکدا سیاسەتت گۆڕی بۆ ئایین، ئەوا بە ئاسانی ئایینیش دەگۆڕێت بۆ سیاسەت. گۆڕینی سیاسەت بۆ ئایین لە گۆڕینی ئایین بۆ سیاسەت خەتەرترە. ڕەخنەگرتنیش لە ئایینی سیاسی، پێشوەخت

وا پێویست دەکات ڕەخنەمان لە سیاسەتی ئایینی گرتبێت. ئەمڕۆ لەژێر سایەی ئەمجۆرە تێڕوانین و تێفکرینە باڵادەستەدا، دەبێت پێشوەخت هەوڵبدەین ڕێگری لەو میکانیزمە بکەین کە حیزبە گەورەکانی ئێمە لە فۆڕمی گرووپی ئایینی نزیك کردووەتەوە. بەمانایەکی تر دەبێت ئاگاداری ئەوەبین بەرگرتن لە ئیسلامی سیاسی، مانای بەرگرتن نییە لە سیاسەتی ئیسلامی. بۆیە من بەگومانەوە تەماشای هەموو ئەو قسانە دەکەم کەوا دەکەن، تەنیا ئیسلامی سیاسی لەپێشی ڕەخنەکانەوە بێت. ئەوانەی وادەکەن خەیاڵ و مەزەندەیەکی وا بکەین کە سەرچاوەی هەڵقوڵانی ڕەهەندە ئایینییەکانی ناو سیاسەت تەنیا لە ئیسلامی سیاسییەوە کەوتووەتەوە، ئەوانەن لە دەرگایەکی تر و لە ڕێگایەکی ترەوە سیاسەتیان بردووەتەوە ناو ئایین. ناکرێت ئەوەی سیاسەتی گۆڕیوە بۆ ئایین، بە دوژمنی ئەوانە و پۆلی پێچەوانەی ئەوانە بزانین کە ئایینیان گۆڕیوە بۆ سیاسەت.

بەشی هەرە زۆری ئەو قسانەی ئەمڕۆ لەسەر ئیسلامی سیاسی دەکرێت، گفتی ئەوانەیە کە بەهێرشکردنە سەر ئاینی سیاسی پەردەپۆشی بۆ سیاسەتی ئایینی دەکەن... لێرەوە قسە گەلێکی جیدی نین. ئەوانەی پێیانوایە چالاکی ئایین لە ژیانی سیاسی ئێمەدا لەگەڵ ئیسلامی سیاسیدا دەست پێدەکات، کێشەکان تا دوائەندازە بچووك و تەسك دەکەنەوە. کێشەی ئیسلامی توندڕەو بەشێکە لە کێشەی سیاسەتی ئایینی. بۆ ئەوەی دژی ئەو سیاسەتە بین کە لە حیزبە ئایینییەکانەوە سەردەردەهێنێت، دەبێت دژی ئەو ئایینە بین کە لە حیزبە سیاسییەکانەوە سەردەردەهێنێت. وەك چۆن دەبێت دژی وێنەی ئەو ڕزگارکەرە خورافییە بین

که سیاستمەدارانی ئـایینی بڵاویدەکەنـەوە، دەبێـت دژی وێنـەی هـەمان ڕزگارکەری خورافی بین کە هەندێك لە ڕۆشنبیران و سیاسییەکانی ئێمە بۆ ئەمریکا یان بۆ هەندێ لە هێزە ناوخۆییەکانی دروست دەکەن... "مەهدی مونتەزەر" بەسوار ئەسپێکەوە بێت و شمشێر و قورئانی هەڵگرتبێت، یـان بەسوار فرۆکەیەکی جێتی ئەمریکییەوە بێت و شەپقەی مارینزی لەسەردا بێـت. هـەردوو ئـەم وێنەیـە بەرهـەمی (خەیاڵگەیـەکی میتۆلۆژییـە)، بەرهەمی خەیاڵگەیەکە دواجار گـرەوی مێـژووی خـۆی خسـتووەتە سـەر وێنەی ڕزگارکەرێکی خورافی...

ئەم قەیرانەی ئێمە ئەمڕۆ تیا دەژین، ئەوەی ئاشکرا کرد (خەیاڵگـەی هەنـدێ ڕۆشـنبیران) و (خەیاڵگـەی ئـاییني هەنـدێ لـە تیرۆرسـت و توندڕەوان) لـە یـەکتر جیـا نەبووەتـەوە. ئـەوەی ئاشـکرا کـرد زۆر لـە ڕۆشنبیرانی ئێمە هێشتا چاوەڕوانی جـۆرە مـودێلێکی دیکـەی "مەهـدی مونتەزەر دەکەن". جیاوازی نێوان مەهدی ئیسلامییەکان و مەهـدی ئـەو برا ڕۆشنبیرانە ئەوەیە، کە مەهدی یەکەم لە تەپوتۆزی میتۆلۆژیای کـۆن پاك نەبووەتەوە، مەهدی دووەم بارگاویکراوە بـە کۆمـەڵێك ئەکسسـوار و مۆدێل نیگاری مۆدێرنە... هەندێك پێیان وایـە کـە دژی ئیسـلامییەکان بوون، یان لەگەڵ ئەمریکادا بوون، ئیتر بەوجۆرە دژایەتی خۆشیان بۆ ئایین ڕاگەیاندووە، بەڵام کێشەی سەرەکی من لەگەڵ ئەو برادەرانەدا، خودی ئەو نیگا ئایینییەیە کە دەیدەنە ئەمریکا. من لەم بۆچـوونەمدا تـەواو تـەبام لەگەڵ کۆی ئەو خەتەی لە سەرەتاوە ئیشم لەسەر کردووە، ئەویش گەڕانـە

بۆ ئایین لە دەرەوەی ئاییندا. گەڕانە بۆ ئایین لە سیاسەتدا، لە تێکسدا، لە زەینی ڕۆشنفکراندا...

ئەم قەیرانە جیهانییەی ئەمڕۆ ئەوەی ئاشکراکرد کە هەندێ لە ڕۆشنبیرە باشەکانی ئێمە، هێشتا لە (چاوەڕوانی مەهدیدا) دەژین. ئەمریکا لای ئەوان گۆدۆ نییە، بەڵکو مەهدییە. واتە وێنەی فریادڕەسێکی بەرجەستە و کۆنکرێتی هەیە... فریادڕەسێکی ئایینی. ئەمریکا لە (نەستی سیاسی) ئەو برایانەدا، هەمان شوێنی هەیە کە (مەهدی) لە (نەستی سیاسی) ئیسلامییکاندا هەیەتی...

٢- بەشی دووەم بەرگرتنە لە جەنگ. بەبێ ڕێگرتن لە شەڕ، سنوورێك بۆ تەشەنەکردنی توندڕەوی ئیسلامی دانانرێت... تا جەنگ هەبێت، زەمینەی گەشەکردنی ئەمجۆرە تێگەیشتنە لە دونیا و سیاسەت ئامادەیە. شەڕ تەنیا هێزی مەرگدۆست دروست دەکات. جەنگ عەقڵییەتی جیهاد و تەکفیر و شەهادەت بەرهەم دەهێنێت. لە کۆمەڵگایەکدا کولتووری شەڕ نەبووبێتە بەشێکی گەورە لە کولتووری سیاسی و ڕۆشنبیری، بە ئاسانی وشەی شەهادەت لە سیاقی خۆی ناکرێتە دەرەوە. واتە لە مانا ڕەمزییەکەیەوە نابرێتەوە سەر مانا ئایینییەکەی. ئەو شەڕانەی ئێستا دژی ئیسلامی سیاسی دەکرێت، بە بەهێزبوون و گەورەبوونی ئیسلامی سیاسی دوایی دێت. ئێستا ئەمریکا و حوکمڕانی ناوچەکە، باشترین کەش و هەوای گەشەی ئیسلامی سیاسی دابین دەکەن. ئەم جەنگەی ئەمریکا دیارییەکی خوداییە بۆ ئیسلامییەکان و دەرەنجامەکانی لەسەر دونیای ئێمە زۆر ترسناکە... ئەوەی پێمان وابێت ئەمریکا دەتوانێت ڕیشەکانی

ئیسلامی سیاسی دەربهێنێت، کورتبینییەکی سیاسییە وەك پڕۆژە لەسەر ئاستی مێژووییدا. کێشەی من لەگەڵ زۆربەی ئەو برادەر و ڕۆشنبیرانەی لەگەڵ شەڕدان، لەو خاڵەدایە کە (ئاستی سیاسی ڕاستەوخۆ) لە (ئاستی مێژوویی دوورمەودا) جیا ناکەنەوە. ئەمریکا بە شەڕ لە ئەفغانستان، زەمینەیەکی کۆنکرێت و دیدێکی ڕوون و مۆدێلی ململانێیەکی کاملّی پێشکەش بە ئیسلامییەکان کرد کە پێشتر بە ڕوونی لەبەردەستیاندا نەبوو. بە کوشتنی بنلادنیش "گیڤارا"یەکی ئاینیشیان پێشکەش دەکات کە دەبێتە ئیلهام، دیارە بە زیندوویش دۆخەکە هەر هەمان ڕیتم و ڕەزمی هەیە.

دیارە من دەزانم لەناو هەراو زەنا و گەرمی لێدان و شەڕدا، کەس ئاوڕ لەم جۆرە بۆچوونانە ناداتەوە، بەڵام دڵنیاشم لە ئاستی مێژووییدا ئەمریکا ئیلهامێکی قووڵی بەخشی بە بزاوتە سیاسییەکانی دنیای ئیسلام. ئیلهامێك لەوە بەهێزترە بە فڕۆکەی ب١ و ب٢ و مانگە دەستکردەکان کۆنترۆڵ بکرێت. من جارێکی تر لێرەدا بڕوای قووڵی خۆم بەو تێزەیە دووپات دەکەمەوە، وەستان دژی ئاینی سیاسی بە دژایەتیکردنی جەنگدا دەڕوات. هەموو جەنگێك زیندووکردنەوەیەکی گەورەی ئیسلامی سیاسییە، لە دیوە هەرە توندڕەوەکەیدا. بۆ نموونە هەندێك لەوانە دەڵێن: (تەماشاکە دوای جەنگی کەنداو، سەدام حسێن لە جاران لاوازترە. ئەمە خاڵێکی باشە، لێرەوە شەڕ بزاوتی تاڵیبانیش لاواز دەکات، کەواتە دەرەنجامی ئیجابی هەیە). ئەم عەقڵییەتە هێندە کورتبینە ئەوە نابینێت شەڕی کەنداو، کۆنەپەرستی عەرەبی دەیانجار بەهێزتر کرد. کۆی

ئۆپۆزسیۆنی ئایینی، هەستی ئایینی گۆڕی و عەلمانی گەیاندە ڕیسواترین و نزمترین خاڵی خۆی. لە جەزائیر کەش و هەوای سەرکەوتنی ئیسلامییەکانی خولقاند، لە تورکیا ڕەفاهی هێنایە سەر کار، لە ئەندەنووسیا و فلیپین و ئەفریقیا ڕستێك جەنگی ئایینی خستەوە. سروشتی بزاوتی ڕزگاری شیشان و کشمیر ئۆپۆزسیۆنێکی تا ئەندازەیەك دیموکراسی بوو، (پارتی گەل) پاکستان پارتێك بوو کولتووریکی دیموکراسی لە ململانێی سیاسیدا هەبوو. ئەمڕۆ ئەمریکا فەزایەکی لە پاکستان دروستکرد، (جەمعیەتی زانایانی ئیسلام) بوونەتە پێشڕەو و هێزی چالاکی کۆمەڵگای پاکستان.

ئەی دەسکەوتەکانی شەڕ چی بوو؟ بەراورد بە زیانەکانی (هیچ). "سەدام حسێن" لە شوێنی خۆیەتی و دەیانجار دڕندانەتر خەڵکی عێراق دەپلیشێنێتەوە، تاکە دەسکەوتی ئەو قەوارە سیاسییەیە کە بۆ ئێمە لە بەشێکی بچووك و سنوور بۆکێشراوی عێراق دروستبووە. قەوارەیەك بەجۆرێك لە پلەی لاوازی و ئەژنۆلەرزیدایە لەبەردەم "سەدام حسێن"دا، گەر پێشتر دەیانوێرا بە "سەدام حسێن" بڵێن (فاشی)، ئێستا نەوەك خۆیان ناهێڵن خەڵکی تریش پێی بڵێت (فاشی). ئەوانەی لەگەڵ شەڕدان پێیانوایە شەڕی ئیسلامی سیاسی دەکەن. بەرگریکردن لە شەڕ جگە لەوەی لە ڕووی ئەخلاقییەوە، کەوتن و هەرەسێکی ترسناکی ئەخلاقی سیاسی ئەو ڕۆشنبیرانە نیشاندەداتەوە، لە ئاستی سیاسیشدا گەورەترین خزمەتە بە ئیسلامی سیاسی و لە ئاستی فیکریشدا نیشانەی پاك نەبوونەوەی هزری ئەو ڕۆشنبیرانەیە لە میتۆلۆژیا و ئایینەکان.

بەجۆرە دژایەتیکردنی ئیسلامی سیاسی تەعبیر نییە لە جێهێشتنی شوێنگە و ڕوانگەی ئایینی، بەڵکو تەعبیرە لە گەڕانەوە و چەقبەستن لە شوێنگە و ئاییندا. شەڕکردن لەگەڵ ئیسلامی سیاسیدا دەنگەدەنگ و هاوار هاوار و دەنگ بەرزکردنەوە نییە، دواکەوتنی شیکردنەوەی سەتحی و دەرەنجامی پەلە دروستی ناکات. گواستنەوە نییە لە زهنییەتی (فەتواچی ئایینییەوە) وە بۆ (فەتواچی عەلمانی)، بەڵکو پڕۆسەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ناوخۆیە کە هێزەکانی ئەم کۆمەڵگایانە دەبێت خۆیان پێی هەستن و کەس لەبری ئەوان پێی هەڵناسێت. لایەنگریکردنی شەڕ لای من ڕاستییەکی تاڵی سەلماند، ئەویش ئەوەیە ئەوە تەنیا حیزبە عەلمانییەکان نین کە دەموچاوی ژێر دەمامکە عەلمانییەکەیان سیما و ڕوخسارێکی ئایینییە، بەڵکو ڕوخساری ڕاستەقینەی دەمامکی هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئێمەیش لە ژێرەوە هێشتا ڕوخسارێکی ئایینییە.

**شوان ئەحمەد: زۆرێك هەن ئەمڕۆکە ئێوەی برادەرانی (ڕەهەند) بەوە تاوانبار دەکەن کە قسەتان لەسەر ئیسلامی سیاسی نەکردووە، لەکاتێکدا من تەواو پێچەوانەی دەبینم. ئێوە وەك چۆن لە زۆر مەسەلەی تردا دەسپێشخەر بوون، دەرهەق بە ئیسلامی سیاسیش هەمان هەڵوێستتان هەبووە. (لە وێنەو تراژیدیادا) بەدرێژیی لەو مەسەلەیە دواون، ئێمە وەك سەرچاوەیەکی گرنگ هەمیشە چاوێکمان لەسەر ئەو مێزگردەیە. لە میانەی قسەکانی ئەو مێزگردەدا "بەختیار عەلی" وردبینانە دەستنیشانی ستراتیژی کاری ئیسلامی سیاسی دەکات لە واقیعی کوردیدا**

و دەڵێت: (بزاوتی ئیسلامی بزاوتێکی کوردی نییە، بەڵکو بزاوتێکە لە کوردستان. مەبەستی سەرەکی ئەم بزاوتەش گۆڕینی وێنەی کوردە بۆ وێنەی موسڵمان، واتە سڕینەوەی سیمای کوردییە و گەورەکردنی سیمای موسڵمانە لای مرۆڤی کورد. ڕوونتر بڵێین بزاوتە ئیسلامییەکان ترسناکترین هەوڵن بۆ تێکشکاندنی هەموو دەلالەتەکانی هەوڵ و خەباتی کورد، لەم سەدەیەدا و بیناکردنەوەی وێنەی موسڵمان لە چوارچێوەی خەلافەتێکی ئیسلامیدا کە هەڵبەت ناوەندەکەی لە جێگایەکی ترە). لە سەروبەندی ئەم بۆچوونە واقیعبینەدا، پرسیاری ئێمە ئەوەیە: ئایا مافی خۆمان نییە لەبەردەم ستراتیژ و کارکردنێکی لەو جۆرەدا، ترس دامانگرێت و بەگومانەوە سەیری کار و چالاکی ئیسلامییەکان بکەین؟

بەختیاری عەلی: جارێکی تر دەبێت لێرەدا شتەکان تەواو وردبکەینەوە. (نامۆبوون بە کورد، نامۆبوون ناگرێتەوە بە واقیع). دیارە دڵنیام ئەوە ڕستەیەکی تا ئەندازە ئاڵۆزە. نامۆبوون لە کورد واتە نامۆبوون لەو ستراتیژ و ئومێد و پڕۆژانەی وەك نەتەوەیەك ئێمە دەگەیەنێت بە ئامانجێکی دیاریکراو، بەڵام نامۆبوون لە واقیع، واتە نەبوونی زەمینەیەك بۆ ئیشکردن و گەشەکردن و گەیاندن و پێگەیان لە واقیع خۆیدا. هەرەسی پڕۆژەی ناسیۆنالیزمی کوردی و هەلاهەلابوونی، کوردبوونی گۆڕیوە بۆ جۆرە پڕۆژەیەکی نامۆ. دیارە من پێموایە کە ئیسلامی سیاسی نامۆیە بە پڕۆژەی سیاسی ئێمە، بەڵام خۆ نامۆ نییە بە شکست و هەرەسی ئەو پڕۆژەیە. دیارە ئیسلامی سیاسی تەعبیر لە خەونە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی ئێمە ناکات، بەڵام خۆ تەعبیر لە شکستی

ئەو خەونانــە دەكــات. نــامۆبوون بــە واقیعــی كــورد، مانــای نــامۆبوون ناگرێتەوە بە شكستی ئەو واقیعە... ئیسلامی سیاسی ئینتمــا ناكــات بــۆ (كوردبوون)، بــەڵام ئینتمــا دەكــات بــۆ واقیعــی دوای شكســتی پــڕۆژەی كوردبوون. ئێمە لەناو واقیعی شكستدا دەژیــن، هــیچ كەســیش بــە وردی ناتوانێت بزانێت واقیعێكی شكست چی بەرهەم دەهێنێت.

دەگەڕێمەوە سەر مانــای جەوهــەری پرســیارەكەی بــەڕێزتان. مــن وەك ڕۆشنبیرێك ناكرێت داواكاری ئەوەبم هێزێكــی سیاســی قەدەغــە بكرێــت، هەتا ئەگەر ئــەو هێــزە سیاسییەش ســەددەر ســەد هــەڵگری جــۆرە بــۆ چوونێكی پێچەوانە و جیاواز بێت لەگەڵ بۆچوونەكانمدا. مومكینیش نییە تاكە هێزێكی سیاسی بە مەترسیدار بزانم و داوای ئەوە بكەم بخرێتــە ژێــر چــاودێرییەوە. مــن لەگــەڵ چــاودێركردنی هــەموو هێــزە سیاســییەكانی كوردستانم، لە ڕێگای كۆمەڵێك دەزگای چالاكی كۆمەڵگای مەدەنییــەوە. تا ئەو جێگایەی ئێمە كۆمەڵگایەكی مــەدەنیمان نییــە ئــەو چــاودێرییە پیادە بكات، كاتێك قسە لە چاودێری دەكەین وەك ئەوەیە گڵۆپی سەوز بۆ حیزبــە باڵادەســـتەكان هەڵكــەین تاهێزەكــانی دی جڵــەو بكــەن و ئازادییــەكانیان زەوت بكــەین. دەرەنجامــەكانی جــۆرە ئیجرایــەكی لــەو شێوەیەش، دیار نییە و كەس نازانێت بەكوێ دەگــات. لێــرەوە مــن دەڵــێم دەبێت بە گومانەوە سەیری چالاكی هەموو حیزبییەكان بكــەین... ئــەمڕۆ ئەم كارەساتە پەڕیوەتەوە بۆ خۆرئاواش، تا ئەندازەیەكی زۆر ســنوورگەلێك بۆ ئازادییە فەردییەكان دادەنرێت. پتر لە سەدا شەستی زۆربــەی قۆناغــە تاریكەكانی مێژووی هاوچەرخ بەو شێوەیە دەســتی پێكــردووە، مەترســی

هێزێك دەكرێتە بنـەمای خنكانـدن و كوشـتنی دەسـكەوتەكانی ئـازادی. ئەوەی شتێكی لە كەش و هەوای دنیـای بـەر لـە سـەرهەڵدانی جـەنگی یەكەم و دووەمی جیهانی خوێندبێتەوە، پلەی لێكچوونەكان دەبینێت.

بۆ قسەكردن لەسەر ئیسلامی سیاسـی، هەمیشـە كۆمـەڵێك ئاسـت هەیە دەبێت لەیەكیان جیابكەینەوە. ئیسلامی سیاسی وەك بزاوتێـك كـە سـەرەتایەكی هەیـە و لـە سـاتێكی مێژوویـدا دێـت و خزمـەتی جـۆرە ئاراستەیەكی دیاریكراو دەكات. واتە قسەكردن لەسـەر هەلومەرجـەكانی سەرهەڵدانیان و هەڵوێستیان لە كێشە گرنگەكانی دنیای ئێمە، ئەمەیان تەوەرێكی گرنگە. پێموایە لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێین كە ئیسلامی سیاسـی تەواو لە دوای ڕاپەڕینەوە وەك بزاوتێكی گـرنگ دێتـە مەیـدان، سـات و شێوەی دەركەوتنی ئەوە ئاشكرا دەكات كە ئیسلامی سیاسی لەلای ئێمـە درێژكراوەی ئەو شەپۆلە سیاسییە گەورە جیهانییەیە كە لە زۆربەی دنیادا دوای سـەركەوتنی شۆڕشـی ئێرانـی، بونبەسـتی خـەباتی فەلەسـتینی، هەرەسی چەپ، ئیفلاسی ناسیۆنالیزم لە ناوچەكەدا هاتـە مەیـدان. واتـە دەركەوتنی ئیسلامی سیاسی، بریتییە لە ڕەنگدانەوەی مێژووی دەوروبـەر لەسەر مێژووی ئێمە، بەڵام ئەم ڕەگ و ڕیشە دەرەكییە، بەمانای ئەوە نییە كە ئیسلامی سیاسی تەنێكی نامۆیە بە واقیعی ئێمە. دەشێت ئیسـلامی سیاسی تەنێكی نامۆبێت بە خواستە نەتەوەییەكانی ئێمـە، بـەو پـرۆژە و یۆتۆپیا و خەونانەی لە خەیاڵی نوخبەی خوێندەواری كـوردا بـووە، بـەڵام تەنێكی نامۆ نییە بە واقیعی ڕۆحـی نەتەوەیـەك كـە پـتر لـە دەسـەدەیە ئیسلام تەنیا مەرجەعی ڕۆحی و ئەخلاقی زانستیەتی. نـامۆش نییـە بـە

کەش و هەوای تێکشکانی سیاسی و کاڵبوونەوەی فیکریی کە حیزبە کوردییەکانی تر تیا دەژین. نامۆش نییە بەو دواکەتنە سیاسی و مەعریفییەی کوردستان تیا نوقمە.

ئیسلامی سیاسی کە خێرا گەشە دەکات و لە ماوەی دەساڵدا لە هیچەوە دەبێتە هێزێکی گرنگ، ئەوە نیشانەی ئەوەیە لە واقیعی ئێمەدا زەمینەیەك هەیە باوەش بۆ ئیسلامی سیاسی دەکاتەوە. بەڕێزتان ئەو پارچەیەتان لە مێزگردی وێنە و تراژیدیا وەرگرت. من تائێستا قەناعەتم بەڕاستی و دروستی ئەو بۆچوونانە هەیە، بەڵام حەز دەکەم بەشێوەیەکی فراوانتر سەیری تێڕوانینی من بکەیت. واتە ئەو بۆچوونانە لە بۆچوونەکانی دیکەی خۆم دانەبڕم و وەك یەك یەکە تەماشایان بکەین. من دڵنیام ئیسلامییەکان بێباکن دەرهەق بە مانای ئەو خەباتە نەتەوەییەی لە سەدەی بیستدا پیادەبوو، بێباکن چونکە دواجار لە دیدی ئیسلامییەکانەوە بزاوتی ناسیۆنالی ئێمە بزاوتێکی عەلمانی بووە. ئەمە جگە لەوەی گونجاندنی چەمکی نەتەوە بەو مانایەی بزاوتە ناسیۆنالیستەکان بەکاریدەهێنن (بەو پێیەی نەتەوە دەستنیشانی گرووپ و مەرجەعی کۆمەڵایەتی و سیاسی تاکەکەس دەکات)، تەواو جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی ئیسلامییەکاندا کە ئایین گرووپی مرۆڤ و مەرجەعە کۆمەڵایەتییەکان دیاری دەکات. لێرەدا ئیسلامی سیاسی مەترسییەکی گرنگ و بەرچاوی لە دەستنیشانکردنی شوناسی مرۆڤی کورددا بۆخۆی هەیە. واتە بەر لە دەرکەوتنی ئیسلامی سیاسی، لەنێوان ئیسلامبوون و کوردبووندا کێشەی شوناس بەو ئەندازەیە سەخت نییە، بەڵام ئیسلامی

سیاسی جەنگێك لەنێوان کوردبوون و ئیسلامبووندا دروست دەکات. بەر لە دەرکەوتنی ئیسلامی سیاسی، پێکەوە ژیانی کوردبوون و ئیسلامبوون ئاسانتر و سادەتر و بێ کێشەتر بوو، بەلاّم ئیسلامی سیاسی، ئیسلام دەگۆڕێتە سەر پڕۆژەیەکی سیاسی. وەك شوناسێك دەیهێنێتە پێشێ کە مەرجەعییەتی کوردبوون تا دوا ئەندازە لاواز دەکات. کە دەڵێم مەرجەعییەتی کوردبوون، مەبەستم لە کوردبوونە وەك پڕۆژەیەکی سیاسی.

ناسیۆنالیزمی کورد لە جەوهەریدا ئەو کەلێنەی هەیە کە هەر شوناسێکی ئەلتەرناتیڤی دیکە، دەتوانێت لەوێوە زەبری کوشندەی لێ بوەشێنێت. کە کوردبوون وەك شوناس نەبێتە پڕۆژەیەك و مانایەك و بزوێنێکی ڕۆحی، لەو دەقیقەیەدا هەموو پڕۆژەیەکی دی کە دێت ئەو لاوازی و بێتینییەی ئەو قوڵتر دەکاتەوە. بەڵێ، ئیسلامی سیاسی لاوازکردنی سیمای کوردبوون و بەهێزکردنی سیمای ئیسلامبوونە، بەلاّم ئەوەی زەمینەی ئەو لاوازکردنەی خۆشکردووە خودی ناسیۆنالیزمی کوردییە.

دەرکەوتنی ئیسلامی سیاسی، قەیرانی شوناسی سیاسی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا چەندەهاجار قوڵتر کردەوە. کۆمەڵگای ئێمە لە ساتێکدا دەژی شوناسی سیاسی بەرهەم ناهێنێت، بەڵکو ڕیزێك (درۆزنە شوناس) بەرهەم دەهێنێت کە ناچارە بەردەوام (لەناو خۆیدا) لەگەڵ دژەکەیدا خۆی بگونجێنێت. هیوادارم ئاگاداری ئەوە بیت کە وشەی (لەناو خۆیدا) بەکاردەهێنم. واتە ئاساییە لە دەرەوە، لە جەریانی ژیانی سیاسیدا

خۆت لەگەڵ دژەکەتدا بگونجێنێت، ئاساییە لە کۆمەڵگایەکدا بژین و پرۆژەی سیاسی جیاواز و دژی تیابێت، بەڵام ئاسایی نییە ئایدیۆلۆژییە سیاسییەکان هێندە یەکتری کۆلاجکەن و کۆپی بکەن، دواجار شوناسێکی ڕاستەقینە بوونی نەمێنێت. دواجار حیزبەکان ببن بە خێڵی شارنشین و ئینتماکردن و نەکردن بۆ حیزب، پەیوەندی بە هیچ ڕەهەندێکی عەقڵییەوە نەمێنێت. بەجۆرێك ئەوەی لەو کۆلاجکردنانە بەرهەمدێت وەك شوناسێکی ناوکۆیی سەقامگیر بێت، بەڵکو بێشوناسی و بێ ئاسۆی بێت.

ئەمڕۆ ئیسلام و ناسیۆنالیزم بەجۆرێکی سەیر خۆیان لەیەکدی موتوربە دەکەن. ناسۆنالیستەکان دەڵێن ئێمە لە جەریانی کاری خۆماندا هەموو پایە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئیسلام دەپارێزن. ئیسلامییەکانیش دەڵێن خودی دەوڵەتی ئیسلامی، دەوڵەتێکی نەتەوەی کوردیش دەبێت. بزاوتە ناسیۆنالیستەکان پرۆژەی ئیسلام دەکەنە بەشێك لە پرۆژەی خۆیان، بزاوتە ئیسلامییەکانیش پرۆژەی ناسیۆنالیزم دەکەنە بەشێك لە مۆدێلی خۆیان. (لە سەدەی ناسیۆنالیزما)، بەدرێژایی قسەم لەسەر ئەو مەسەلەیە و مەترسییەکان و ڕەهەندە تۆتالیتارییەکانی کرد. ئەوەی ئایدیۆلۆژیایەك پرۆژەی ئەوانی دی دەکات بە بەشێك لە پرۆژەی خۆی، تا بەهانەی مان و مانای بوونیان لێبستێنێتەوە.

کێشەی گەورە ئەوەیە ئەم پاوانکردنە بە قەیرانێکی ترسناکی شوناس دوایی دێت. بەوەی گرووپە سیاسییەکان دەبنە کۆپی یەکتر، ڕۆژنامەکانیان دەبنە کۆپی یەکتر، ئیعلامیان دەبێتە کۆپی یەکتر. لێرەوە هیچ پرۆسەیەکی دیاریکردن و دەستنیشانکردن و پێناسەکردنی جیاواز

دروست نابێت. لە واقیعێکی وادا بچووکترین گرووپی سیاسی مافی ئەوە دەداتە خۆی، قەبەترین دروشم هەڵگرێت. لێرەوە سەیر نییە بچووکترین گروهە سیاسییەکانی ئێمە، دروشمی یەکگرتنەوەی چوارپارچەی کوردستان هەڵدەگرن. یان کۆمەڵێك چەکداری نەخوێندەوار، خۆیان دەکەن بە ئەمیرلموئمنین و دەبنە سەنتەری فەتوادەرکردن و لە دوو گوندی دوورە دەستی ناو شاخ و کێوی دنیادا، شەریعەت جێبەجێ دەکەن. نەبوونی ئاراستەیەکی سیاسی و نەبوونی پرۆژەیەکی سیاسی، وایکردووە واقیعی ئێمە پڕبێت لە فەنتازیای رەش. لە مۆتەکە و کابوسی سیاسی کە لە شێوەی یۆتاپیای رۆحی و ئەخلاقیدا، پێشکەش بە خەڵك دەکرێن.

لە واقیعێکدا قەیرانی حەقیقەت لە هەموو ئاستەکانیدا ئیش دەکات، ئاساییە بچووکترین هێز خۆی وەك هەڵگری گەورەترین پەیام بناسێنێت. لە واقیعی وادا کە شوناس، پێناسە، جیاوازی، سنووری جیاکەرەوە بوونی نییە، ئاساییە هەموو هێزێك چی سیفەتێك و نازناوێك بیەوێت و لە خەیاڵگەی خۆیدا پەروەردەی کردووە، بیداتە پاڵ خۆی... ئیدی حیزب لەدایك دەبێت بە ئەندازەی پۆلێکی قوتابخانەیەکی ئامادەیی موریدی نییە، ناوی حیزبی نەتەوەیی لەخۆی دەنێت. رۆژنامە لەدایك دەبێت، لە هەولێر دەردەچێت و سلێمانی ئاگای لێ نییە، ناوی رۆژنامەی نەتەوەیی لەخۆی دەنێت. گرووپ دروست دەبێت خۆیان بە رزگارکەری بەشەرییەت دەزانن. لە واقیعێکی وادا هەموو ناونانەکان دەبن بە شتێکی مومکین.

ئێستا ئێمە کۆمەڵگایەکین بێ پرۆژەییەکی سیاسی. لێرەوە کە سیستمی ئینتماکردنی سیاسی عەقڵانی بوونی نەبوو، پێوەری سیاسی عەقلانیشمان بۆ هەڵسەنگاندنی ئینتماکردنەکان لەبەردەستدا نابێت. ناسیۆنالیزمی کوردی، کوردبوونی لە مانا سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانی کردە دەرەوە و کردییە وەرەقەی گەمەکردنی... ئیسلامی سیاسیش، ئیسلامبونی لە شوناسێکی ئایینییەوە گۆڕییە سەر شوناسێکی سیاسی، بێئەوەی بتوانێت مانای کۆنکرێت و ئاسۆی ڕوون بداتە ئەو شوناسە سیاسییە. بەکورتی مەترسی ئیسلامی سیاسی، درێژکراوەی ئەو مەترسییانەیە کە لە ستراکتۆری ئێمەدا دەژی و هەڕەشە لە بوونمان دەکات. ئەم مەترسییە ئیبداعێك نییە ئیسلامی سیاسی دروستی کردبێت، هێند هەیە ئیسلامییەکان بە هۆشیارییەوە پڕۆژەی لاوازکردنی شوناسەکانی دی دەگرنەبەر، بێتەوەی خۆیان توانایان هەبێت لە سێبەری ئەو شوناسانەی تر دەرچن. بێئەوەی توانایان هەبێت خۆیان لە تارمایی پڕۆژەی ناسیۆنالیزم دووربگرن. ئیسلامی سیاسی ئەو ڕێگا بنبەستەیە کە مرۆڤی ئێمە لە قەیرانی گەڕانی خۆیدا بۆ شوناس، دەچێتە ناویەوە و لەوسەرەوە دووبارە بێ شوناس دێتەوە دەرەوە.

**شوان ئەحمەد: مەترسییەکی دیکەی ئیسلامی سیاسی لەسەر واقیعی ئێمە جگە لەو مەترسییەی لە پرسیاری پێشوودا ئاماژەمان پێکرد، هەڕەشە و مەترسی ئەوانە لەسەر دیموکراسییەت و ئازادی و قبولکردنی جیاوازی، چونکە ئەوان لە جەوهەردا بڕوایان وایە کە دەبێت هەموومان**

**بێ جیاوازی یەك حەقیقەت قبوڵ بکەین، یەك مەرجەعییەتمان هەبێت... هەرچی پرۆسەی دیموکراتیشە لای ئەوان (کوفرێکی پەتیە) وەکی "عەلی بلحاج دەڵێت، یاخود لە باشترین حاڵەتدا ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و دامەزراندنی حوکمێکی ئیسلامی. پرسیاری من ئەوەیە لە ژینگەیەکی تەواو ماندووی وەك کۆمەڵگای کوردیدا، هاوکات لەگەڵ دەرککردن بەو ڕاستییانەی سەرەوەش، دیموکراسییەتی زیاتر و فراوانکردنی ڕووبەری ئازادی، زەمینە لەبەردەم ئەم گروهە شمولییانەدا خۆشتر ناکات تا زیاتر تەشەنە بکەن و دواجار کۆنترۆڵی کۆمەڵگای ئێمە بکەن. ڕوونتر بڵێم، ئێمە بەم کارەمان دەرگا لەسەر دۆزەخ ناکەینەوە، دۆزەخێك چوون دۆزەخەکەی ئەفغانستان؟**

**بەختیار عەلی:** ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا هێندەی ستراتیژێکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی دیاریکراوی هەیە، ستراتیژێکی سیاسی ئاشکرای نییە. یان لایەنی کەم هێندەی گوتارە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکەی خۆی بڵاودەکاتەوە، بەئاشکرا قسە لەسەر ئامانجی سیاسی پرۆژەکەیان ناکەن.

گومان نییە لەوەی هاتنی ڕژێمێکی ئیسلامی (لە کوردستان بێت یان هەر کۆمەڵگایەکی موسڵمانی دیکەدا)، ئەگەری (ئاڵوگۆڕی ئازادی دەسەڵات) تا دوائەندازە بچووك دەکاتەوە، بەڵام کێشەی من لەگەڵ ئەو تەرحەی سەرەوەی تۆدا کێشەیەکی سیاسییە، بەمانایەکی تر ئەو بۆچوونە تاڕادەیەکی زۆر بەرهەمی ڕاگەیاندنی سیاسی حیزبەکانی ترە، بەرهەمی فۆبیاسازی و پیشەسازی وەهم دروستکردنە. ئەو بۆچوونەی دەڵێت (لە

کوردستان دیموکراسییەتی حیزبە ناسیۆنالی و عەلمانییەکان هەیە کە ئیسلامییەکان هەڕەشەی لێدەکەن. لێرەوە دەبێت زۆر دیموکراسی نەبین، نەوەك ئەو دیموکراسییەتە زۆرە ببێتە مایەی ئەوەی هێزە نادیموکراسییەکان زەفەرمان پێبەرن). بەداخەوە ئەم تێزەیە لە ئەلفەوە تا یا هەڵەیە، چونکە لە جەوهەردا هیچ دیموکراسییەتێك نییە ئیسلامییەکان هەڕەشەی لێ بکەن. ئیسلامییەکان هێزێکی نادیموکراسن لەناو کۆمەڵێك هێزی نا دیموکراسی دیکەدا. دیارە ئەمە بەو مانایە نییە کە بڵێین: (حیزبە کوردییەکان بە موتڵەق هەموو وەك یەکن)، دوای ئەوە نوختەیەك دانێین و تەواو. ئەمە سادەکردنەوەی کێشەکانە. من خۆم بەر لە هەر کەس دیفاعم لەو تێزەیە کردووە کە ستراکتوری سیاسی و کۆمەڵایەتی حیزبەکانی ئێمە لە قوڵاییدا وەك یەکە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە جۆرێك لە جیاوازی دەمێنێتەوە، هەندێ جار ئەو جیاوازییانە بێبایەخن و هەندێ جاریش گرنگن و دەبێت ببینرێن... بۆ نموونە سیستمێکی دیکتاتۆر کە دەست لە هەندێ شتە تایبەتییەکانی فەردەوە وەرنادات، ئاسانتر قبوڵ دەکرێت وەك لە سیستمێکی ئایینی کە دەست لە ورد و درشتی ژیانی فەردی دەدات. سیستمێکی وەك میسر بە هەموو ئەو خەوشە ترسناکەی ناوی، ماقوڵتر لە سیستمی تالیبان دەنوێنێت. من دەتوانم لەژێر سایەی حوکمڕانی یەکێتی و پارتیدا بژیم، بەڵام ناتوانم لەژێر سایەی سستمێکدا بژیم، شیعر قەدەغە بکات و ڕیشم پێ بهێڵێتەوە. بەزۆر حیجاب بکاتە سەر کچەکەم و چۆنییەتی جلی خێزانەکەم دیاری بکات. مەکتەب بگۆڕێتەوە سەر حوجرەی کۆن. ئەمانە جیاوازین و دەبێت

بیانبینین، بەڵام حیزبە سیاسییەکانی ئێمە ئەم جیاوازییانە بۆ (ئیبتزازی سیاسی) بەکاردەهێنن. ئەوان ئاماژە بەو مۆدیلە خراپە دەکەن تا پێمان بڵێن: (تەماشاکەن کەی ئێمە ئەوەندە خراپین، تەماشاکەن و بەم شتە ڕازی بن کە ئێمە بۆمان فەراهام کردوون، چونکە ئەڵتەرناتیڤی ئێمە ئەم مۆدێلە ترسناکەی ترە. تەماشا بکەن و گەر زۆر فشار بکرێت، ئەڵتەرناتیڤەکەی ئێمە یان بەعس یان تاڵیبانە).

ئەم سیاسەتی ئیبتیزازە پرۆسەی بیناکردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی، پرۆسەی سەقامگیرکردنی دیموکراسییەتی خەساندووە. ئەم سیاسەتی ئیبتیزازەیە کە من قبوڵم نییە. تەوزیفکردنی ترس لە ئیسلامی سیاسی، بووە بە چەکێك بۆ پاراستنی فەزایەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆنزەرڤاتیڤ. ترس لە ئیسلامییەکان نەبووەتە مایەی بەهێزکردنی دیموکراسیت، بەڵکو بووەتە مایەی بێهێزکردن و سنوور بۆ دانانی دیموکراسیت و قایمکردنی جێ پێکانی ڕاسترەوی ئایینی. ئەمرۆ سیاسەتێك لە کوردستاندایە مایەی قێز و شوورەییە، ئەویش ئەوەیە حیزبە کوردییەکان هەر کات لەگەڵ باڵێکی سیاسی ئیسلامییەکاندا بە جەنگ دێن، دواتر لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا ڕستێك تەنازولی ترسناك بۆ ڕووکارە دواکەوتووە کۆمەڵایەتییەکانی ئایین دەکەن. لە گرووپێکی ئاینی دەدەن، دوای ئەوە ڕاستەوخۆ بۆ ئەوەی هێزە کۆنسەرڤاتیڤەکانی ئێمەیان لێ نەڕەنجێت، لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا کۆمەڵێك پایەی نەریت و ئەخلاقیات و ڕەفتاری ئاینی بەهێز دەکەن.

واته باجی سەرکەوتنی سیاسی حیزبێکی ئێمە بەسەر هێزێکی ئیسلامیدا، کچانی کورد و گەنجانی کورد لە ئازادی خۆیان دەیدەن. هێزە ئیسلامییەکان و هێزە نەیارەکانیان یەك چاوبەستمان لەگەڵدا دەکەن، بەلای منەوە گرنگە هەردوو مەترسییەکە ببینین. هەندێك هەن لەو بانگەشە نادروستەی دیموکراسییەت کە حیزبە عەلمانییەکانی کورد دەیکەن هێندە نائومێدن، مەترسی توندڕەوی ئایینیان لەبیر دەچێت. هەندێکیش بەجۆرێك تەسلیمی ئەو فۆبیا گشتییە دەبن کە ئەمڕۆ لەسەر ئیسلامی سیاسی بڵاودەبێتەوە، چیتر گەرووی ڕەخنەگرانەی خۆیان دەرهەق بە ئێستا و دەسەڵاتی ئێستا دەخنکێنن.

لە ڕاستیدا لە ئاستی سیاسیدا قسەکردن لەسەر ئایینی دیموکراسی و نادیموکراسی قسەیەکی بێمانایە، هیچ ئاینێك لەم سەر زەوییەدا دیموکراس یان لیبراڵ نییە، چونکە دواجار ئایین بەرهەمی قۆناغێکی گەشەی فیکری ئینسانە کە کێشەکانی دیموکراسییەت بەوشێوەیەی ئەمڕۆ ئێمە تێدەگەین، ئامادەگیان نییە. لێرەوە ئیسلامی دیموکراسی و مەسیحییەتی نادیموکراس یان بەپێچەوانەوە، بوونیان نییە... ئایین لە ئاستی سیاسیدا مەرجەعێکی موتڵەقە. لێرەوە سیاسەتی هەڵقوڵاو لە ئایینەوە، پەیوەستێکی ئەوتۆی بە دیموکراسییەتەوە نابێت. پەیوەستی گرووپە ئیسلامییەکان بە دیموکراسییەتەوە پەیوەستییەکی بەرپرسە، لەرزۆك و نامەبدەئییە.

ئەمڕۆ لە ئێران حیجاب چەند سانتیمێ لەپێشی سەرەوە چووەتە دواوە، هەندێك دەیانەوێت ئەوە بکەنە بەهانەی (دیموکراسیبوون لە ئێران)دا.

لەگەڵ هەموو ڕێزماندا بۆ هەوڵەکانی "خاتەمی"، بەڵام ئێران بە هەزارەها فەرسەخ لە دیموکراسییەتەوە دوورە. لەم ڕوانگەیەوە ئایین خۆی و ئایینی سیاسی دوو شتی جیاوازن. ئایین بەمانا فیکری و سۆفی فەلسەفییەکەی لە قوڵاییدا، پرسیارگەلێکی ڕۆحی و تایبەتییە، دەروازەیەکی کراوەیە بەسەر وجودا، مەستییەکە مرۆڤ بە ئاڕاستەی مەحەبەت و عەشقدا دەبات، بەڵام گۆڕینی پەیوەندی ڕۆحی مرۆڤ بە وجودەوە بۆ پەیوەندییەکی سیاسی بە کۆمەڵگاوە، بۆ ئاستی سەپاندنی تێگەیشتنی شەرعێکی نەگۆڕ بەسەر هەموو دنیادا، ئەمە کوشتنی ئەو ئەگەری پێکەوە ژیانەیە کە هەموو بۆچوونێکی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت.

ئایین وەك (سیستمێکی) حوکم کە جیای دەکەمەوە لە ئایین وەك سیستمێکی تێڕامان و تەفسیری هیرارکییانەی بوون و خەلیقەت، تا ئەندازەیەکی زۆر بریتییە لە ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی فەرد، نەوەك ڕیکخستنی پەیوەندی فەرد بە خوداوە. پەیوەندی فەرد بە خوداوە پەیوەندییەکی ڕۆحی و ناوەکییە، کە هیچ هێزێکی سیاسی ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات. خوداپەرستی بە جوندولاو جوندولئیسلام و مەفرەزەی تەفتیشکردن و هێزی (ئەمر بلمەعروف و نەهی لەمونکەر) ناسەپێنرێت، چونکە دواجار عەشق بە پۆلیس و شمشێر و هەڕەشە و تۆقاندن لە دڵی مرۆڤدا سەقامگیر ناکرێت و لاش نابرێت. پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە کە پلەیەکی قوڵە لە پلەکانی عەشق، ئەوا ئەم پەیوەندییە بە سیاسەتدا ناڕوات و پێویستی بە سیاسەت نییە. عەشقی ڕاستەقینەی خودا لە سۆفییەتدا تەواو دەبێت، نەوەك لە دروستکردنی حیزب و قاعیدە

و گروهی تیرۆردا. ئەم جۆرە ئایینە سیاسەتبازە، دەستێوەردانێکی توند و بێڕەحم و دلڕەقانەیە لە ژیانی فەردیی. دیموکراسییەتیش تائەندازەیەکی زۆر بریتییە لە کردنەوەی دەرگا لەسەر ئازادیی فەردەکان. من باوەڕم بە یەکگرتنەوەی (ئایینی سیاسی) و (دیموکراسیەت) نییە. نە ئاینێکی دیموکراسی هەیە نە دیموکراتییەتێکی ئایینی، بەلام دەشێت پێکەوە ژیانێکی هەمیشەیی هەبێت. ژیانی سیاسی ژیانێکی گۆڕدراوە، مادام کۆمەلگا دەگۆڕێت، سیستمی سیاسیش دەگۆڕێت، بەلام حوکمکردنی سیاسییانە بە ئایین، دەولەتی داڕێژراو لەسەر بنەمای ئایین، ناتوانێت ئەو دوو گۆڕانکارییە جوت بکاتەوە، بۆیە پێویستی بە پۆلیسی فیکر و پۆلیسی ئەخلاق دەبێت تا خۆی بچەسپێنێت.

من پێم باشە ئایینەکان بلێن ئێمە دیموکراسی نین، هیچ نەبێت لەمەدا ڕاستگۆییەك هەیە کە بواری هەلبژاردن و بڕیارمان بۆ جێدەهێلێت. کێشەکە ئەوکاتە بەرجەستە دەبێت کە هێزگەلێکی دوژمن بە دیموکراسییەت، دروشم و تەکتیك و بەهاکانی دیموکراسییەت دەکەنە سەرپۆش بۆ دیکتاتۆرییەت. با ئیسلامییەکان ناچار نەکەین بەدرۆ پێمان بلێن (ئێمە دیموکراتین). ئەمە خەتەرێکی گەورەیە، بەلکو دەبێت هەولبدەین قەناعەتیان پێ بکەین لەگەل دیموکراسییەتدا مامەلە بکەن و وەك بەشێکی دانەبڕاو لە ژیانێکی سیاسی دادپەروەرانە تەماشای بکەن. نابێت ئەوەمان بیربچێت کە دواجار ئیسلامی سیاسی بەناوی خوداوە قسە ناکەن، بەلکو دەستەیەك مرۆڤن و لەسەر قانونەکانی سیاسەت کاردەکەن، بە گەمەی ستراتیژ و تاکتیك کاردەکەن... کە دیموکراسییەت

بەشێك بوو لە کولتوور، کە یاسایەکی کۆمەڵایەتی هەبوو توانیبووی ڕێزی خەڵك بەدەسبهێنێت، لەوکاتەدا ناکرێت هیچ هێزێك بە ئاسانی ژێرپێی بخات...

گەر ئیسلامییەکان بەشێوەیەکی دیموکراسی دژایەتی دیموکراسییەت دەکەن، ئەوە کارێکی خراپ نییە. خەتەر ئەوەیە بەجۆرێکی نادیموکراسی قسە لە حوکمی دیموکراسی بکەین، وەك ئەوەی حیزبە کوردییەکان ئەمڕۆ دەیکەن. دیارە من دەزانم دواجار ترسەکە ئەوەیە (ئەی ئەگەر ئەو دوژمنانەی دیموکراسیەت، بە دیموکراسیەت هاتنە سەر حوکم، ئەوکات چی... ئەی ئەوکات دەڕۆن؟ ئەوکات ڕێزی دیموکراسییەت دەگرن و ئازادی کارکردن لەوانی تر زەوت ناکەن؟). ئەمە ئەو پرسیارە تەقلیدییەیە کە دووبارە دەبێتەوە. ئەم پرسیارە جوان و گرنگ و پڕبایەخ دەبوو کە لە کوردستان دوو حیزب پایە و پارێزەری دیموکراسی نەبوونایە کە هەشت ساڵە نەك لەسەر (تەداولی ئازادی دەسەڵات)، بەڵکو لەسەر داهاتی دوو گومرك ڕێك ناکەون. لە ئێستادا کە وڵاتی ئێمە دیموکراسییەتێکی تێدا نییە، گەر ئیسلامییەکان و هەر کەسێکی تری غەیرە ئیسلامیش بێتە سەر کورسی حوکم، دەسەڵات چۆڵ ناکات. گەر کولتووری دیموکراسی بەهێز بووایە، خودی ئەو کولتوورە لە هەناوی پێکهاتی کۆمەڵایەتیدا پاسەوانی خۆشی دروست دەکرد، بەڵام خەتەری گەورە ئەوەیە کە تۆ کۆمەڵێك حیزبت لەناو (عەلمانییەت) هەیە چ سروشتی پێکهاتی ناوخۆیان، چ جۆری ئیدارەکردنی کۆمەڵایەتییان، چ شێوەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ دەسەڵات و تەداولکردن و گۆڕیندا، پەیوەندی بە

دیموکراسییەتەوە نییە. گەر پارتی و یەکێتی نموونەیەکی باشیان لە سروشتی گۆڕینەوەی دەسەڵات بدایە، ئەمڕۆ بەرامبەر مۆدێلی ئیسلامییەکان زەمینەیەك دەبوو شانی بدەینە سەر تا جەبرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتییان لەسەر دروست بکرێت، بۆ ئەوەی ڕێزی ئەو کولتوور و یاسایە بگرن.

ئەوە تەنیا ئیسلامییەکان نین دیموکراسییەت وەك کەرەسەیەکی تەکنیکی بۆ هاتنە سەر حوکم سەیر دەکەن، حیزبەکان دیموکراسییەت وەك تەکتیکێکی هاتنە سەر حوکم تەماشا دەکەن و گەر خۆشیان نەبوونە دەسەڵاتداری موتڵەق، (بەخێرهاتنی شەڕ) و ئیدی چەك قسە دەکات. لە ساڵی ١٩٩٤یشدا ئەوەمان تاقیکردەوە، پێویستیش ناکات بەو ئەزموونەدا بڕۆین تا تێی بگەین. گەر دەمانەوێت دیموکراسییەت پایەداربێت، با جارێ داوا لە دۆستەکانی دیموکراسییەت بکەین، لەوانەی ئەمسەر بۆ ئەوسەری گوتاری ڕاگەیاندنیان باسی دیموکراسییەت دەکەن، ڕێزی هەندێ بنەمای سەرەتایی دیموکراسیەت بگرن. ناکرێت دوژمنەکانی دیموکراسییەت دیموکراسییەتیان لە دۆستەکانی خۆشتر بوێت. دیموکراسییەتی بەهێز تەنیا ڕۆژی هەڵبژاردن چارەنووسی دیاری ناکات، بەڵکو هێزی گەورەی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵێك دەزگای ڕای گشتی، کۆمەڵێك نووسەر و ڕۆشنبیر کە وەك ویژدانی کۆمەڵگا دێنە قسە، کۆمەڵێك قازانجی سیاسی و ئابووری دەیپارێزێت.

هیچ هێزێك، هیچ حیزبێك خۆی دیموکراسی قبوڵ نییە، بەڵکو دیموکراسییەت قبوڵ دەکات. ئیسلامییەکانیش لە دەرەوەی ئەو

هاوكێشەیە نین، بەڵام گەر ئەو شتەی پێی دەگوترێت دیموكراسی، جەستەیەكی شێواو بوو لەژێرەوڕا سەدان دیاردەی دزێو و ناشیرینی داپۆشیبوو، لە پشتەوڕا تیرۆر، تۆقاندن، تەشهیر، هەژاری، دابەشكردنی نادادپەروەرانەی دەسەڵات و سامانی كۆمەڵایەتی هەڵگرتبوو. گەر ئەوەی پێی دەگوترێ دیموكراسییەت، هەموو دەسەڵاتی دا بە چەند كەسێك و خستنییە سەروو قانونەوە، گەر كۆمەڵگایەكی دروستكرد كۆمەڵێك منداڵ تیایدا لە جوانترین پۆشاك و ئوتۆمبێل و كۆشكدا بژین، تازەترین یاریی كۆمپیوتەر بكەن، لە قوتابخانەی تایبەتدا بخوێنن و سەدان هەزار منداڵی تر ببن بە عەلاگەفرۆش و ئاوفرۆش و شقارتەفرۆش. گەر ئەم دۆخەمان ناونا دیموكراسییەت، واتە هەموو ناشرینی دزێوییەكانی دنیای خۆمان ناوناوە دیموكراسییەت. گەر دیموكراسییەت ئەمە بێت، ئەو كات ناتوانێت خەڵكانی سەرجادە و دوژمنەكانی و دۆستەكانی قەناعەت پێ بكات. ئەو كات هێزی ئەوەی نابێت، نە لەگەڵ تیرۆردا، نە لەگەڵ فاشیزمدا، نە لەگەڵ بەعسدا، نە لەگەڵ هیچ داگیركەرێكی تردا بجەنگێت.

جیاوازی هەرە گەورەی نێوان ئایین و دیموكراسییەت، لەوەدایە كە دیموكراسیەت دەبێت (ئیسلامی سیاسی) قبوڵ بكات، لە كاتێكدا كە ئیسلامی سیاسی دیموكراسییەت قبوڵ ناكات. گەر دیموكراسییەتیش ئیسلامی سیاسی قبوڵ نەكرد، لێرەدا جیاوازییەك لەنێوان دیموكراسییەت و ئیسلامی سیاسیدا نامێنێتەوە. دیموكراسییەت ناچارە ئیسلامی سیاسی قبوڵ بكات. بەڵێ، منیش دەڵێم ئیسلامییەكان (كاتێك قسە لەسەر

دیموکراسییەتیش دەکەن، هەر دیموکراسی نین)، بەلاَم کێشەی گەورەی دیموکراسییەت ئەوەیە کە قەدەغەکردنی نادیموکراسییەتیش هەمیشە بە مردنی دیموکراسییەت دوایی دێت. ئەوە تەنیا لە سیستمە زۆر خۆگر و پتەو و بەهێزەکاندایە کە دیموکراسییەت دەتوانێت، لێرەو لەوێ هەندێ شت قەدەغە بکات بێئەوەی خۆی بخنکێنێت، بەلاَم لە مەملەکەتی ئێمەدا کە دیموکراسییەت هێشتا لەدایك نەبووە، هەموو بیرکردنەوەیەك لە دارِشتنی سیستمی قەدەغەکردن و مەنعکردن، بە خنکانی ئەگەرەکانی دیموکراسییەت تەواو دەبێت. لە دنیای ئێمەدا بەناوی پاراستنی دیموکراسییەتەوە، دەکرێت هێزێك هەموو ئەوانی تر قەدەغە بکات. هێندەی یەك جار گوترا (ئەوانەی دیموکراسی نین بالێبدرێن). ئیدی ئەوە دەبێتە ئەو بەیداخی شەرعییەتەی حیزبێك لە رێگایەوە هەموو هێزەکانی دی قەدەغە بکات. نەخێر، دیموکراسییەت لە سیفەتی هەنگدایە کە چزوەکانی خۆی دەرهێنا بۆ ئەوەی بە یەکێکەوە بدات خۆی دەمرێت، چونکە دیموکراسییەت تەنیا لەو دەقیقەیەدا مانای هەیە کە (نادیموکراسییەت) قبوڵ دەکات... واتە کە دیموکراسییەت دەیەوێت نادیموکراسییەت بخنکێنێت، لە راستیدا زیانی گەورە لەخۆی دەدات.

دیارە ئەوانەی کە خەڵکی بێگوناه دەکوژن، تیرۆری خەڵك دەکەن، ترس بلاَودەکەنەوە، دەبێت پێشیان لێ بگیرێت... ئەمەیان قسەی تیا نییە، هیچ کەس و هیچ ویژدانێکی زیندوو دژی ئەمە نییە. هیچ رۆشنبیرێکیش سەری خۆی بۆ کۆمەڵێك تیرۆریست نایەشێنێت، بەلاَم لێدان لە تیرۆر پەیوەندی بە دیموکراسییەتەوە نییە. ئەوەی من لەگەڵیدا جوت نایەمەوە،

ئەم شەڕە بەناوی دیموکراسییەتەوە بکەیت. دەشێت حکومـەتێکی فاشـی، کێشەی لەگەڵ تیرۆردا بۆ دروست ببێت. دەشێت دەوڵەتێکی خێڵـەکی وەك دەوڵەتـەکانی کەنـداوی عــەرەب، تووشــی گــرفتی تیرۆربـن. ئەمــەیان کێشەیەکی ترە. هەر کەس دژ بە تیرۆر وەستا، مانای ئەوە نییـە شـەڕ بـۆ دیموکراسییەت دەکات. خەڵك کوشـتن هەزارسـاڵ بـەر لـە لـەدایکبوونی دیموکراسی، وەك سیستم لە هەموو شەرعەکاندا قەدەغە بووە. ئەوەی ئێمە دەبێت بەرابـەری بوەسـتین، ئـەو سـیاق و سروشـتەیە کـە کێشـەی تیـا دەخرێتەڕوو. کێشەکە ئەوەیە ئەمڕۆ کەسانێك بـەم جـۆرە بـیر دەکەنـەوە و دەڵـێن (ئێمــە دژی تیرۆریــن، کەواتــە ئێمــە دیموکراســین. مـادام ئێمــە دیموکراسین، کەواتە مـافی ئەوەمـان هەیە نەهێڵین نادیموکراسەکان شوێنیان لە ژیانی سیاسیدا هەبێت). لەکاتێکدا من لەو باوەڕەدام کە دەکرێت ئـەو گوتارە بەم جۆرەی خوارەوە دابڕێژرێت (ئێمە دژی تیرۆرین، ئەمە مانای ئەوە نییە ئێمە دیموکراسین، بەوەدا دیموکراسیبوونی ئێمـە و نـەبوونمان هێشـتا تەواو لەژێر پرسیاردایە، کەواتە داڕشـتنی کولتـووری جـەرام و قەدەغـە زیانێکی گەورە لەو دیموکراسییەتە دەدات کە هێشتا لەدایك نەبووە).

ئەمڕۆ خەتەری ئیسلامی سیاسی تەنیا ئەوە نییە کە دیموکراسی نـین، دواجار شەڕی نێوان ئیسلامییەکان و ئەوانی تر شـەڕی دیموکراسـییەت و نادیموکراسییەت نییە، بەڵکو شـەڕی نێـوان کۆمـەڵێك میلیشـیایە کـە لەســەر گونـد و کـەپك و چـیاکان بەشــەڕ دێـن. بـەپێی پارسـەنگ و هاوسەنگی هاوکێشە هەرێمایەتییەکان دەجوڵێنرێن، ئەم جۆرە سەرە کـەم و زۆر پەیوەندی بە دیموکراسییەتەوە نییە. خەتـەری ئیسـلامییەکان ئـەوە

نییە کە ئەگەر بێن، ئەمریکا چەکوشی ئامادە بۆ پاراستنی هەندێك هێزی ئیسلامی ڕاناگرێت... واتە هاتنیان کۆتاییهێنانە بە هەموو ئەو فۆرمە سەرەتایی و پارچە پارچەیەی دەسەلات کە ئێستا لە کوردستاندا هەیە... دیارە ئەمە لەپاڵ مەترسییان لەسەر کۆمەڵێك ئازادیی فەردی و لەسەر ئافرەتان.

لێرەوە دەگەڕێمەوە سەر ئەو پرسیارەی بەڕێزت (ئایا تەشەنەکردنی ئیسلامییەکان تا کۆنتڕۆڵکردنی کۆمەڵگەی ئێمە) لە حسابدایە، یان نا؟

لە ڕاستیدا مێژوو هەمیشە بەشێوەی تەواو چاوەڕوان نەکراو ڕەفتار دەکات. من ئەگەرچی دژ بەو قوتابخانانەم کە تەواو عەقلانییانە سەیری جوڵەی مێژوو دەکەن، بەڵام پێشم وایە بڕێکی زۆر لە نامەعقول لە مێژوودا هەیە، ئەو نامەعقولانەش زۆرجار ڕەوتی هەموو شتەکان دیاری دەکەن. لێرەوە ناتوانم لەبری مێژوو قسەبکەم. سەرەتا حەز دەکەم لە دواوە دەست پێ بکەم، واتە لەو ئەگەرەی ئایا دەکرێت کوردستان ببێتە ئەفغانستان. دیارە من لەگەڵ ئەوەدام کە کوردستان نابێتە ئەفغانستان و ئەگەری وا لە ئێستادا لە گۆڕێ نییە، بەڵام تەفسیرم بۆ ئەو نەبوونە، جیاوازە لە تەفسیری هەندێك برادەری دیکە. بۆ نموونە کە دەڵێم کوردستان نابێتە ئەفغانستان لەبەر ئەوە نییە کە ئیسلامییەکانی ئێمە شتێکی تر و گۆڕاون و کراوەن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە لە زەمینەیەکی تردا کاردەکەن، زەمینەیەك هێزەکانی دی چەندەها جار بەهێزترن و ئەوەی ئێستا هەیە خۆگونجاندنی هێزەکانە لەتەك یەکدا، خۆگونجاندنە لەگەڵ هاوکێشە سیاسییەکاندا و خۆپاراستنە لە خودکوژی سیاسی.

له کوردستان ئیسلامییه‌کان سه‌روکاریان له‌گه‌ڵ خه‌ڵکیکدایه، تائیستا دروشمی خه‌بات بۆ ئازادی و ڕێزگرتنی فه‌رد نرخیکی هه‌یه له‌لایان. ئه‌وه‌ی له‌ژێر ئیستبدادی به‌عسدا ژیابێت، ئه‌وه‌ی له ئه‌نفال هاتبێته ده‌ره‌وه، ئه‌وه‌ی له هه‌رێمێکدا بژی که فرۆکه‌کانی خۆرئاوا ده‌یپارێزن، کێشه‌ی گه‌وره‌ی له‌گه‌ڵ تێز و تیۆره ئیسلامییه‌کاندا ده‌بێت. ئه‌مه به‌و مانایه نییه که ئیسلام ناتوانێت ببێته هێز، به‌ڵام به‌و مانایه شانسی گوتاری ئاینی له کوردستاندا به هه‌مان ئه‌ندازه‌ی ئێران یان ئه‌فغانستان یان فه‌له‌ستین گه‌وره نییه، ئه‌گه‌ر حیزبه کوردییه‌کانی دی ئه‌م ئه‌گه‌ره‌یان پێشکه‌ش نه‌که‌ن.

ئیسلامییه‌کان له ئه‌فغانستان و فه‌له‌ستین و ئێران و لوبنان بۆیه سه‌رکه‌وتنی گه‌وره‌یان به‌ده‌ستهێنا، چونکه دواجار عه‌شقی خودا و عه‌شقی نیشتمانیان له یه‌ك یه‌که‌دا کۆکرده‌وه. ئیسلامییه‌کان زۆربه‌ی کات هێزێکی گه‌وره به‌کارده‌هێنن، بۆ ته‌وزیفکردنی هه‌سته نه‌ته‌وایه‌تییه‌کان له‌پێناو هه‌ستی ئاینیدا. چه‌ند ساڵ له‌مه‌وبه‌ر مارکسییه‌کان هه‌وڵیان ده‌دا هه‌سته ناسیۆنالییه‌کان بخه‌نه خزمه‌تی هۆشیاری چینایه‌تییه‌وه، به‌ڵام نه‌یانتوانی. ئه‌وه به شکستێکی ترسناك دواییهات، به‌ڵام ئیسلامییه‌کان ئه‌مڕۆ له کۆمه‌ڵێك شوێنی دنیادا لێزانانه ئه‌و کاره ده‌که‌ن... من پێموایه هیچ پارتێکی ئیسلامی ته‌نیا له ڕێگه‌ی بزواندنی هه‌ست و نه‌ستی ئاینییه‌وه ناتوانێت خه‌ڵك ڕابکێشێت، جگه له هه‌ستی ئاینی ده‌بێت شتێکی تریش هه‌بێت. دیاره خه‌بات دژی ڕوس و دژی ئیسرائیل و دژی ئه‌مریکا، بۆخۆی ئه‌و هه‌وێنه‌یه که مانایه‌ك

دەبەخشێتە هەڵچوون و بەرزبوونەوەی هەست و نەستی ئاینی. ئیسلامییەکانی کوردستان ئەم چەکەیان بەدەستەوە نییە. دواجار نە بەرابەر جوو وەستاون و نە بەرابەر نەسرانییەت، بەڵکو بەرابەر خەڵکێکن هەمان ئینتمای نەتەوەیی و ئایینیان هەیە.

بانگەواز بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت، ئەو سیحرەی لەسەر مرۆڤی کورد نییە وەك بانگەواز بۆ ئازادیی کوردستان هەیەتی... لێرەوە تا حیزبە بەناو (عەلمانییەکان) پتر هەڵە بکەن و پتر خیانەت لە سەرەتاکانی مۆراڵی ناسیۆنالی بکەن، پتر ئیسلامییەکان بەهێز دەبن. ئیسلامی سیاسی ئەو ڕۆژە لە کوردستاندا سەردەکەوێت کە بتوانێت گوتاری ناسۆنالیستی هەندێ جار چینایەتیش، لە چنگی حیزبە عەلمانی و ناسیۆنالیست و مارکسییەکان دەربهێنێت. بۆیە ئەو هەموو شکات و پێشێلکردنە گەورەیەی سەرەتاکانی کارکردنی نەتەوایەتی، ئەو هەموو بچووکبوونەوە و شەق تێهەڵدانەی قازانج و هەستی نەتەوایەتی، ئەو زوڵم و جیاوازییە بێ سنوور و بێ ئەندازە گەورەیەی لەنێوان هەژاران و دەوڵەمەندانەدا لە کوردستانی ئەمڕۆدا هەیە، دەشێت ئەگەری گەشەکردنی ئیسلامییەکان بەهێز بکات.

بەمانایەکی ڕۆشنتر، ئەگەری گۆڕینی کوردستان بۆ ئەفغانستان لە گۆڕێ نییە، گەر حیزبەکانی تر ئەم ئەگەرەیان لەسەر قاپێك زێڕ پێشکەش نەکەن. یەك ڕاستی بچووك هەیە کە حیزبە کوردییەکان دەبێت بیزانن، هەرگیزاو هەرگیز شەڕ و لێدانی سەربازی ئیسلامییەکان لاواز ناکات، بەڵکو ئەوەی ڕێگا لە گەشەی ئیسلامییەکان دەگرێت،

دامەزراندنی دیموکراسییەتێکی ڕاستەقینەیە. کەمکردنەوەی ئەو جیاوازییە چینایەتییە بێ سنوورەیە کە هەیە، گەڕانەوە بۆ حورمەت گرتن و ڕێزگرتنی سەرەتاکانی گوتاری نەتەوایەتییە. پێشێلکردنی بەردەوامی ئەو سێ چەمکە و کەمتەرخەمی بەرامبەریان، ئیسلامییەکان بەهێزتر دەکات.

**شوان ئەحمەد:** من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانیم وێنەی شەیتان بدەمە ئیسلامییەکانی کوردستان، بەڵام ئەوەی لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەم چەند ساڵەی دوای ڕاپەڕیندا دەبینم لەو گرووپانەدا، تا سەر ئێسقان ماندووم دەکات. ئەوان کە ڕۆژانە تیرۆری ژن دەکرێت، شاباشی دەکەن. فەتوای کوشتنی نووسەران و شاعیران دەردەکەن... لەگەڵ هەموو ئەو شتانەشدا داوای ئەوە دەکرێت تۆ نەرم بیت و نەیانورووژێنیت، ئەم هەقیقەتە نەدەی بە ڕوویاندا... ئەوان چاك دەبن، بەڵام با سوڕی ئاسایی خۆیان تەواو بکەن. کاری ڕۆشنبیر لە هەلومەرجێکی وادا چییە... چاوەڕوانی یان قسەکردن لە ئان و ساتی خۆیدا، تۆ بەرابەر وەها حاڵەتێك دەڵێیت چی و بۆچوونت لەم ڕووە چییە؟

**بەختیار عەلی:** بێگومان دەبێت ئیسلامییەکان لە هەموو کردارە خراپەکانیان ئاگادار بکرێنەوە. حیزبە کوردییەکان تا نەکەونە ئاستی فیشەك و (ئار بی جی)نان بەیەکەوە، ڕەخنە لە یەکتر ناگرن. پێشتر مرۆڤ هەست دەکات هەموو شتێك ئارام و جوان و بەهەشتییە، لەناکاو بێ هیچ پێکۆڵکردن و ڕێگاسازییەك شەوێك موزیعێك دێتە پێشێ و هەرچی

شتێك له فەرهەنگی ئێمەدا دزێو و ناشرینە، دەیهێنێتە دەرێ و بە بەرامبەرەکەی دەڵێت. من لێتی ناشارمەوە، ئەو ماوانەی لەنێوان دوو هێزی کوردستاندا شەڕە، زۆر بەزەحمەت دەتوانم ڕۆژنامەکانیان بخوێنمەوە و گوێ لە ڕاگەیاندنیان بگرم.

من دەزانم کۆمەڵێك باڵی ناو ئیسلامییەکانی کوردستان لە سەرەتای چالاکییانەوە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا تا ئەمڕۆ، خەڵکیان کوشتووە و هەڕەشەیان کردووە، فەتوای سەیریان دەرکردووە، هەوڵێکی گەورەشیان داوە فەزایەکی ئەوتۆ دروست بکەن، نووسەران خۆیان خۆیان سانسۆر بکەن. بەودیویشدا گومانم لەوە نییە کە سیاسەتی ئیستیفزازکردن، بریندارکردن، تورەکردنی ئەنقەستی ئیسلامییەکان لە گۆڕێ بووە، بەڵام بۆ حەقیقەت دەبێت ئەوە بڵێین، ئەو فشار و شێواندن و پەلاماردانەی کە لەم پێنج ساڵەی دواییدا لەلایەن حیزبەکانی ترەوە کراوەتە سەر ڕۆشنبیران، زیاتر بووە لەو فەزای ترسەی هەندێ گرووپی ئاینی بڵاویانکردووەتەوە.

دیارە مەبەستم نییە لێرە هەموو ئەو چیرۆکانە بگێڕمەوە کە تۆ و خوێنەران لە من باشتر دەیزانن، بەڵام دەرکردنی فەتوا بۆ کوشتنی نووسەرێك و کوشتنی بێدەرکردنی فەتوا یەك شتە. ترساندن و تۆقاندنی فیکری، بەشێکە لە کولتووری سیاسی وڵاتی ئێمە. هەندێك لە ئیسلامییەکان لەسەر هەمان کولتوور دەڕۆن، ئیلهام لە سەردەمی سووتان و پارچە پارچەکردنی زەندەقییەکان وەردەگرن. دەبێت هەموو ئەم کولتوورە لە ڕیشەوە ئاشکرا بکرێت. ئیشکردن لەسەر ڕیشەکانی

ئیستیبداد، پەیوەندییەکی زۆری بە ڕابردووی ئاینی ئێمـەوە هەیـە، بـەڵام ئیسلامییەکان تەنیا میراتگری ئەم کولتووورە نین. هەندێك ئـەمڕۆ دەڵـێن کە قسە لەسـەر ئیسـلامییەکان دەکـەن (بـەڵام) بەکارمـەهێنن، ئەمـە بۆچوونێکە مایەی شەرم و شورەییە. قسەکردن لەسەر تیرۆری ئیسـلامییە توندڕەوەکان، لە ڕەوتی قسەکردن لەسـەر تـیرۆر و تونـدڕەویی لـە وڵاتـی ئێمەدا مانای هەیە. توندڕەوی جۆرێکە لە خۆئـەڤینی کـوێر، شـێوەیەکی باڵای نەرجسییەتە کـە بـۆ فـەناکردن و پاکتـاوکردنی بەرابـەر ئامـادەی فەناکردنی خۆیەتی.

نامەوێت لێرەدا لە ئیشکالییەتە تیۆرییەکاندا قوڵ ببمەوە، بەڵام حەز دەکەم ئاماژە بەوە بکەم، ئەوە ئیشی ڕاگەیاندنی حیزبییە کە تەنیا قسە لە خراپەی ئیسلامییەکان دەکات و لە خراپەی ئەوانی تـر بێـدەنگ دەبێـت. جیـاوازی نێـوان ڕۆشـنبیر و مـوەزەفی ڕاگەیانـدن لێـرەدا ئـەوەیـە، کـە ڕەتکردنەوەی ڕۆشنبیر بۆ تـیرۆر و تۆقانـدن و سیاسـەتی فـەتواکردن، لـە سیاقی ڕەتکردنەوەدایە بـۆ پێشـێلکردنی هـەموو ئازادییـەکان لـە هـەر کەسێکەوە بێت. کێشە ترسناکەکە ئەوەیە کە شەڕی ئازادی لەناو شـەڕی حیزبیدا بخنکێنرێت، بەرگری نووسەران و ڕۆشـنبیران لـە ئـازادی بخرێتـە قاڵبـی جەنگی دوو حیزبەوە.

چەندە دەبێت تۆقاندن و کاری خراپـی تونـدڕەوەکان ئاشـکرا بکـەین، دەبێت ئەوە ببینین هەنـدێ تـاقمی سیاسـی کـە لـە هـەمان کولتـووری توندڕەوی ئاو دەخۆنەوە، ڕابردوویان لەگەڵ ڕۆشنبیران و لەگەڵ کێشـەکانی ئازادیدا لە ڕابـردووی ئیسـلامییەکان ڕوونـاکتر نییـە. لـەمجۆرە دۆخـەدا

دەیانەوێت خۆیان وەك پارێزەر و پشت و پەنای ئازادی نیشان بدەن... کە ڕۆشنبیر کەوتە ناو ئەم گەمەیەوە، مانـاو بەهای ململانێکەی کۆتاییهاتووە. شەڕ لەگەڵ تەسکبیری و توندڕەوی ئایینیدا، نابێت بکرێتە شەڕی دوو حیزب، چونکە لەویادا مانا ڕاستەقینەکانی خۆی ون دەکات. ئەوە شەڕی هەموو کۆمەڵگایە نەوەك شەڕی حیزبێك (کە دەشێت خۆی لە هەمان بازنەی توندڕەوی و تەسکبینی)دا بێت. شەڕی ڕۆشنبیرانە کە پێویستە بە کۆ ڕیشەکانی توندڕەویی و توندوتیژی ببینین، نەوەك شەڕی فەرمانبەرەکانی ئیعلام کە نیوەی ڕاستی دەڵێن و نیوەی دەشارنەوە. توندڕەوی ئیسلامییەکان و توندڕەوی حیزبەکانی تر یەك پێکهات و ڕەفتار و ئەخلاقیان هەیە. لە ساڵی ١٩٩٣دا لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر (توندڕەوی) نووسی، ئەوکات شەڕی ناوخۆ دەستی پێ نەکردبوو. وارێکەوت پێشکەشکردنی کۆڕەکە لە سلێمانی بکەوێتە ناو هەرا و زەنای پێکدادانی ئەو زەمانی هێزەکانی یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی، دواتر کە هەمان کۆڕم لە هەولێر پێشکەشکرد، دوای کۆڕەکە بە چەند ڕۆژێك شەڕی ناوخۆ لەنێوان یەکێتی و پارتیدا دەستی پێکرد.

مەبەستم ئەوەیە بڵێم توندڕەوی لێرەیە، لەوساتەدا کە من و تۆ باسی دەکەین ئەو ئیش دەکات. دژایەتیکردنی توندڕەویش ئەوە نییە یەخەی گرووپێك بگرین و ئەوانی تر لە گوناه پاك بکەینەوە. لە ساڵی ١٩٩٢دا تەسکبینی حیزبی و توندڕەویی حیزبی لەنێوان یەکێتی و پارتی لە چڵەوپۆپەدا بوو، دراوسێ خەبەری لە دراوسێ دەدا، لایەنگرەکانیان لەسەر جادە تفیان لەیەك دەکرد، برا تەقەی لە برا دەکرد، هاوڕێ سڵاوی لە

هاورێ نەدەکرد. کۆمەڵگای کورد سەرلەبەری بەشێوەیەکی دزێو دابەشبوو بوو. دواتر ئەو دۆخە لە ساڵی ١٩٩٦دا ئەو هەموو هەڵە گەورە و تراژیدیا ترسناکەی لێبووەوە. کێشەی سەرەکی ئەوەیە تۆ لە ڕووی تیۆری و فیکرییەوە قسە لە کۆمەڵگا نەکەیت و تەنیا هەڵوێستی سیاسی لێوەربگریت. من لەناو ئەو هەموو شەڕ و پێکدادانەدا، دەمەوێت باسێکی ڕاستەقینە لەسەر توندوتیژی بخوێنمەوە، نییە. ڕۆشنبیر بیر دەکاتەوە، تیۆریزە دەکات، ئینجا هەڵوێست وەردەگرێت.

کۆمۆنیستەکان کاتی خۆی دەیانویست خەڵك هەڵوێست لە کوشتاری (پشت ئاشان و قەرناقا) وەربگرن، بێئەوەی قسە لەو ملیۆنەها مرۆگەلە بکرێت کە لە ولاتانی سۆشیالیزمدا دەپلیشانەوە. ئەمڕۆش هەمان حیکایەتە، هەندێك دەیانەوێت هەڵوێست لە کوشتارێکی دیاریکراو وەربگیرێت، بێئەوەی قسە لە هیچی تر بکرێت. من سەد دەرسەد لەگەڵتام کە هەموو ڕاستییەکان دەبێت بە ئیسلامییەکان بگوترێت، بەڵام لەگەڵتا نیم کاتێك شتەکان وا وێنا بکەین ئەم گرووپە لە واقیعی سیاسی کوردی جیابکەینەوە وەك ئەوەی کولتووری گوڵ و ڕێحانە بێت، یان ئەوان تاکە هێزێك بن کە شایستەی ئەوە بن ڕاستییەکانیان بخرێنە بەردەم. من دژ بە هەڵوێستی سیاسییانەم دژ بە گرووپێك بەتەنیا، بەڵکو لەگەڵ هەڵوێستێکی فیکریدام بەرابەر بە کۆی ئەو واقیعەی تیرۆر و توندوتیژی و تەسکبیری پەروەردە دەکات.

**شوان ئەحمەد: باشە من دڵنیام وڵاتی ئێمە ئازادی و دیموکراسییەتی کاملی تێدا نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا هەموو هێز و لایەنەکان بواری کار و چالاکی و قسەکردنیان هەیە. پێت وایە گەر ئیسلامی سیاسی هێزی یەکەم و باڵادەست بوایە ئەم فەزایەی ئێستای بپاراستایە، بواری تەواوی بەهێزەکانی تر بدایە ئازادانە کار بکەن؟**

**بەختیار عەلی:** بەڵێ، دڵنیام گەر بتوانێت هێزەکانی تر بگۆڕێت بۆ هێزی کارتۆنی و بێ کاراکتەر. بیانگۆڕێت بۆ هێزی بێدەنگ کە مووچەی مانگانە وەردەگرن و ڕۆژنامەکانیان باسی هەموو دنیای تیایە باسی کێشەکانی کورد نەبێت... ئەوا بۆ بوار نەدات و مەترسیی ئەم بواردان و نەدانە چییە؟ بەهەر حاڵ با وا دابنێین ئیسلامییەکان دەبنە هێزی باڵادەست و هەموو حیزبەکان و ڕۆژنامەکان قەدەغە دەکەن، ناوی هەموو نووسەران دەخەنە لیستی ڕەشەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئەمە بکەن، پێش ئەوەی بگەنە ئەم ئاستە، دەبێت بڕوای هێزگەلێکی کۆمەڵایەتی گەورەیان بەدەستهێنابێت. دەبێت زەمینەیەکی وا لەباربێت پارتی و یەکێتی زۆربەی جەماوەری خۆیان بدۆڕێنن و ببن بە دوو هێزی بچووک، دەبێت بڕوای هەموو خەڵکی کورستانیان دۆڕاندبێت. بەوەدا کە لایەنگری سیاسی بۆ ئەم دوو هێزە لەوەلائی خێڵەکییەوە نزیکترە نەوەك لەوەلایی ئایدیۆلۆژی و فیکرییەوە، ئیدی ئەگەری وا لەپێش نییە کە ئەو دوو زلهێزەی کوردستان بەئاسانی جەماوەری خۆیان بدۆڕێنن. گەر دۆڕانیشیان واتە بە زنجیرەیەك هەڵەی کوشندەدا ڕۆیشتوون. دەبێت هێزە سیاسییەکانی دی بەجۆرێك لە جۆرەکان خودکوژییەکی دەستەجەمعیان کردبێت، ئەوسا ئیسلامییەکان

دەتوانن دەسەڵات بگرنە دەست. لە جۆرە دۆخێكی واشدا، پێشبینیكردنی ستراكتۆر و پێكهاتی سیاسی زەحمەت دەبێت. بەدڵنیاییەوە حیزبە كوردییەكان بە ئیسلامی و نائیسلامییەوە، حیزبی بێهێز و ئامادەگی ناچالاك و بێ كاریگەرییان پێ قورس نییە.

بەڵێ، ئیسلامییەكان گەر دەسەڵات بگرنە دەست، دەمی هەموو ئەوانە دادەخەن كە مەترسی جدییان هەیە، وەك چۆن پارتی و یەكێتی ئەمڕۆ هیچیان بوار نادەن ئەوی دییان پێ بخاتە هەرێمی ئەوی دییەوە، ئیسلامییەكانیش هەمان سیاسەت دەگرنە بەر، بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەم فاڵگرتنەوەیە نییە. "ئیدوارد سەعید" لە دوا گوتاریدا ئەو پێكدادانەی دنیاكانی ئەمڕۆ ناونانێت (پێكدادانی كولتوورەكان) وەك "هینتنتون" دەڵێت: بەڵكو ناوی دەنێت (پێكدادانی جەهلەكان). بە بۆچوونی من ئەوە ناوە دروست و ڕاستەقینەكەی ئەم پێكدادانەیە، بەڵام لە ڕاستیدا من ئەم شێوەی گریمانە دارێژییەی ئێستا لە كوردستان هەیە ناودەنێم (پێكدانی وەهمەكان). ئەم جۆرە پرسیارانە لە بابەتی ئەوەی ئەگەر ئیسلامییەكان هاتن چی دەبێت؟ لە جەوهەردا لە ترسەوە بۆ ئازادی هەڵنەقوڵیوە، بەڵكو ئەمە پرۆسەیەكی دروستكردنی فۆبیایە. بەشێكی هێزی توندڕەوە ئیسلامییەكان لەو ترسەدایە كە لە دەوروبەری خۆیان بڵاوی دەكەنەوە، ئەوان ئەو وەهمە دروست دەكەن كە شمشێریان شمشێری خودایە و ملی ئەوانە دەپەڕێنێت كە لەگەڵیاندا نین. بەرابەرەكانیشیان ئەو وەهمە ئەستوورتر و بەهێزتر دەكەن. گەر حیزبە كوردییەكان پێیان وایە ئەگەری وا لە گۆڕێیە ئیسلامییەكان دەسەڵات

بگرنـه دەسـت، ئـەوکات دەبێـت لـەو هۆکارانـە بـڕوانن ئـەم ئەگـەرەی دروستکردووە. وەك دەڵێن: (لەبری ئەوەی نـەفرەت لـە تـاریکی بکـەیت، مۆمێك داگیرسێنە). ئەگەری واش لـە گـۆڕێ نییـە. بڵاوکردنـەوەی ئـەم لۆژیکە، بەشێکە لە پڕۆسەی دروستکردنی ترس و فۆبیای کۆمەڵایەتی.

## سەبارەت بە عەلمانییەت

### ڕێبین هەردی

**شوان ئەحمەد:** ئایا عەلمانییەت دەبێت هەر بەو پێناسە تەقلیدییەوە گیربخوات کە جیاکردنەوەی دینە لە دەوڵەت، یاخود پێناسەکردنی جیاواز و هەمەڕەنگە. با لێرەوە دەست پێ بکەین و بپرسین تۆ چۆن پێناسەی عەلمانییەت دەکەیت؟

**ڕێبین هەردی:** بێگومان ڕاستە، دەکرێت مانای جیاواز بۆ عەلمانییەت بدۆزینەوە. دەتوانین هەریەکەمان بەشێوەیەك پێناسی بکەین. ئەمەش کارێکە دەبێت بەردەوام بیکەین و لێی ڕانەوەستین، چونکە (بە پێچەوانەی چاوەڕوانی و بیروڕای باوەوە) فرەیی پێناس دەلالەت لە زیندوویی و لە گۆڕان و لە تەندروستی دەکات. ئەو دەمەی فرەیی پێناس نییە، ئەو دەمەی هەموو لەسەر پێناسێك ڕێککەوتین، ئەو دەمەی چیدی هەست

بەوە ناکەین کە پێویستمان بە پرسیارکردن و گەڕان بەدوای مانای چەمکێکدا هەیە، ئەوا ئەمە بەمانای ئەوە دێت لە دۆخێکی ئیفلیج و نەگۆڕدا دەژین کە بە کۆمەڵێ چەمکی پیرۆز و وەهمی تەنراوە.

لە ڕاستیدا ئەوکاتەی چیدی پێناسی چەمکێك ناخەینە ژێر پرسیار و بەدوای مانای تازەدا بۆ ئەو چەمکە ناگەڕێین، ئەو ئەمە بەمانای ئەوە دێت ئەو چەمکە بووە بە چەمکێکی پیرۆز و موقەدەس، چونکە تەنها پیرۆز و موقەدەسە کە پرسیاری لێ ناکرێت و ناگۆڕێت و بۆ ماوەیەکی درێژیش وەك خۆی دەمێنێتەوە. سەیرەکەش لەوەدایە ئەم حاڵەتە بەسەر چەمکێکدا بێت کە بە پێناسە و لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە هاتووە، پیرۆزی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی داماڵێت و خاکی بکات. وابزانم "نیچە"یە کە لە شوێنێکدا دەڵێت: (تەنها شتە نامێژووییەکانن کە پێناسیان هەیە)، چونکە هەموو شتێکی مێژوویی مادام لە مێژوودایە و بەناو مێژوودا دەڕوات، ئەوا بە ناچاری لە سەردەمی جیاوازدا مانای جیاواز و پێناسی جیاواز پەیدا دەکات. کەوابوو پرسیارەکە ئەوە نییە چ پێناسێکی عەلمانییەت ڕاستە، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی پێناسێکی دیاریکراو بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە و نەفی هەموو گۆڕان و پشکنینێکی تازە دەکات؟ لە بەرژەوەندی کێ و بۆچی پێناسێك، دەبێت بە سەنتەر و کۆی ئەگەری پێناسەکانی دی دەکوژێت؟

هەست دەکەم لە پشت هەر جۆرە گۆڕان و پشکنینێکی تازەوە، بەرژەوەندی کۆمەڵێ هێزی دیاریکراو هەیە کە دەبێت ئاشکرای بکەین و قسەی لەسەر بکەین. من بیر لەوە ناکەمەوە ڕاسترین پێناسی عەلمانییەت

چییە (چونکە هەرگیز بەڕاسترین پێناس ناگەین)، بەڵام زۆر بیر لەوە دەکەمەوە مەبەست و ئامانجی ئەو کەسانە بخوێنمەوە کە پێناسێکی دیاریکراوی پێ دەبەخشن و سەرسەختانە بەرگری لێدەکەن... بیر لەوە دەکەمەوە بۆچی و لە پێناوی چیدا ئەو پێناسە دیاریکراوەیان قبوڵکردووە و بەرەو چ ئاڕاستەیەك دەیانەوێت بڕۆن و چ مەبەستێك پاڵی پێوە دەنێن. ئایا ئاڕاستەی پێناسەکە بەرەو پێشخستنی ژیان و کرانەوەی زیاتر و دادپەروەری زیاترە، یان بۆ دیسپلین و چاودێریکردن و سانسۆرکردنی زیاترە.

بۆ من گرنگ نییە تۆ چ پێناسێك بۆ عەلمانییەت دەکەیت (هەموو لەوەدا ئازادین چ پێناسێك بۆ خۆمان دەڵدەبژێرین)، بەڵام بۆ من زۆر گرنگە تۆ بۆچی و لەپێناوی چ مەبەستێکدا لەناو ئەو هەموو پێناسەیەدا پێناسێکت لە واقیعێکدا هەیە، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی یەك پێناس لەبری هەموو پێناسەکانی دی دادەنیشێت. عەلمانییەت لای من لە بەشێکیدا بریتییە لە فرەیی پێناس، واتە دژایەتی هەموو پێناسێکی سەنتراڵ و نەگۆڕ و بەیەك وشە، واتە گەڕانەوە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، بۆ مێژوویبوون و بۆ گۆڕان. عەلمانییەت واتە ئەو ساتەوەختەی تێدەگەین حوکم و زانست و یاساو هەموو دراوەکانی ئەم دونیایەیە، دیاردەی مرۆیین و هەر لێرەشەوە و بەپێی پێداویستییەکانی مرۆڤ دەتوانن بگۆڕێن و دەبێتیش لە قۆناغی جیاوازدا مانای تازەو نوێ وەربگرن.

**شوان ئەحمەد:** زۆرێـك لـە ئیسـلامگەراكان بـە بڕوبیـانووی ئـەوەی عەلمانییەت چـەمكێكی خۆرئاواییــە و تایبەتـە بـە ژینگـەی خۆرئـاوا، دژایەتی عەلمانییەت دەكـەن. لـە كاتێكـدا لـەمڕۆدا عەلمانییـەت لـەوە كەوتووە كـە تـەنها لـە ڕووبـەرێكی جوگرافیـدا گیربـدرێتێت و بووەتـە دیاردەیەكی ژیاری و گەردوونی و حەیاتیش. سەبارەت بەم مەسەلەیە چی دەڵێیت؟

**ڕێـبین هـەردی:** دەبێـت بـزانین مەبەسـتی ئـەو كەسانەی قسـە لـە خۆرئاواییبوونی دەكەن چییە؟ بەڕاستی مەبەستیان چییە كـە دەڵـێن ئـەم دیاردەیە خۆرئاواییە؟ خۆ گەر قسە لە مێژووی دروستبوونی ئەم چـەمكە دەكـەین، ئـەوا دەبێـت بـە ڕۆژژمێـری ڕوداوە فیكرییـەكانی خۆرئـاوادا بگەڕێین، بەڵام پڕ ئاشكرایە مەبەستی ئەوانـەی بـاس لـە ڕۆژئـاواییبوونی چەمكەكە دەكەن، شتێكی زیاترە لەوەی ئاماژە بۆ مێـژووی سـەرهەڵدانی چەمكەكە بكەن. ئەوانەی كە دەڵێن عەلمانییەت دیاردەیەكی خۆرئاواییە، مەبەستیان ئەوەیە شتێكی تایبەتە بـە خۆرئـاوا و وەك جـۆری خـواردن و جلوبەرگ و تەقالید، موڵكی تایبـەتی ئەوانـە و بـۆ كۆمـەڵگاكانی دی دەست نادات. واتە لەم تێڕوانینەدا دوو كولتوور و دوو مێـژووی دوور لـە یـەكت هەیـە كـە وەك ئـەوەی لـە دوو دوورگـەی داخـراودا بـژین، هـیچ پەیوەندییەكیان بەیەكەوە نییە. ئەوی بۆ ئەوان دەشێ و دەكرێت، بۆ ئێمـە ناشێ و ناكرێت، بەڵام ئایا بەڕاستی ئەم تێڕوانینە تاسەر دەتوانێت لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بێـت؟ ئایـا تاسـەر دەتوانێـت هـەموو ئـەو شـتانەی لـە ڕۆژئاوادا هەیە، بە موڵكی تایبەتی خۆرئاوا بزانێـت كـە قـابیلی سـوود

وەرگرتن نییە لە کولتووری دیدا؟ ئایا تا سەر دەتوانێت هەموو ئەو شتانەی بەرهەمی خۆرئاوان، وەك خەسڵەت و دیادەیەکی تایبەت بەوان تەماشا بکات کە بۆ کۆمەڵگاکانی دی دەست نادات؟

پڕ ئاشکرایە سەرنجێکی سەرپێیی، هەموو ئەو درۆ گەورانە ئاشکرا دەکات کە ئەم جۆرە تێڕوانینە لەسەری بونیادنراوە. کۆمەڵگاکانی دی چەند سەدەیەکە شت لە خۆرئاواوە وەردەگرن و سوودی لێدەبینن و کەسیش باس لە خۆرئاوایبوونیان ناکات. تەکنەلۆژیا و زانستە جۆراوجۆرەکان قەرز دەکات و باسی خۆرئاوایبوونی ناکات. ماشێن و کۆمپیوتەر و قیرتاوکردنی شەقامەکان وەردەگرێت و بیری دەچێت کە لە شوێنی دیدا قسەی لە دابڕان و لەیەك دووربوونی ئەو دوو مێژووە کردووە. کەناڵی فەزایی دەکاتەوە و بە زمانی سینەما و پڕوپاگەندەی تەلەفزیۆنی کار دەکات و لەبیری دەچێت هەموو ئەمانە خۆرئاوایین.

دەی ئاخر گەر مەسەلەکە تەنها خۆرئاوایبوونە، چییە وادەکات بۆ ئەجۆرە شتانە کەس قسە لە خۆرئاوایبوون ناکات و کە دێتە سەر دەستکەوتە مەعنەوییەکان، هەموویان هەڵایان لێهەڵدەسێت و باسی خۆرئاوایبوون دەکەن. بۆچی کۆمپیوتەر و دەرمانی پزیشکی و زانستی هەندەسە و تەکنەلۆژیای تازە، دەگونجێن و ئەوانی دی ناگونجێن؟ ئەم پرسیارە بەجدی وەربگرین، چونکە ئەوانەی قسە لە خۆرئاوایبوونی عەلمانییەت و کۆی چەمکە مۆدێرنەکان دەکەن، حوجەتی سەرەکییان خۆرئاوایبوونە نەك هیچ شتێکی دی... کە مەسەلە خۆرئاوایبوونیش بێت، ئەی خۆ ئەم پەڕەیەی کە تیای دەنووسین و ئەو کۆمپیوتەرەی پێی

چاپ دەکەین و هەر ئەم رۆژنامەیەی تیایدا بڵاویدەکەینەوە، هەر هەموویان خۆرئاوایین... ئەی لێرەدا بۆ قسە لە خۆرئاوایبوون دەکەن و لە هەندێکی دیدا قڕوقەپی لێدەکەن؟ بێگومان من وەڵامی ئەم پرسیارانە دەزانم کە لەلایەن ئەمجۆرە کەسانەوە دەکرێت. دەزانم دەڵێن تەکنەلۆژیا کارئاسانی ژیانی مادیمان بۆ دەکات و دەستکاری کۆی ئەو دابونەریتانە ناکات کە لە باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە... کۆمپیوتەر و تەکنیکی چاپ و دروستکردنی شەقامەکان ژیانمان ئاسانتر دەکات، بەڵام هەڕەشە لە هیچ شتێکی مەعنەوی ئێمە ناکات.

کە دەشپرسین بەڵام بۆچی دەترسین لەوەی هەڕەشە لەو ژیانە مەعنەوییە بکات، بۆچی لە گۆڕانی عادات و تەقالیدەکانمان دەترسین... بەڕاستی بۆ جیهانی مەعنەوی و ڕۆحی و دابونەریتەکانمان نەگۆڕێت؟ ئەم وەڵامە نامێژووییە وەردەگرینەوە کە ئەوانە خسوسیاتی ئێمەن و لەدەستدانیان لەدەستدانی شوناسی خۆمانە. کاتێکیش ئەمجۆرە قەناعەتە دەخەینە ژێر سەرنجەوە، دەبینین بەرگەی یەك پرسیاری سەرەتایش ناگرێت و لە یەکەم وردبوونەوەدا پوچی دەردەکەوێت، چونکە بەپێی ئەم تێگەیشتنە بێت عادات و تەقالیدەکانمان قەدەری ئێمەن و بۆ هەمیشە دەبێت وەك خۆیان بمێننەوە و نەگۆڕێن. جیهانی ڕۆحی ئێمە هەریەك جیهانە کە لە باپیرانەوە دەست پێدەکات و تا دوا نەوەش دەبێت درێژەی هەبێت، بەڵام ئایا بەڕاستی وایە؟ ئایا مرۆڤ هەریەك جیهانی ڕۆحی هەیە کە لە سەرەتای مێژووەوە دەست پێدەکات و بۆ ئەزەلیش بەردەوام دەبێت؟ ئایا هەریەك عادات و تەقالید هەیە کە بەدرێژایی وەك خۆی دەمێنێتەوە

و ناگۆڕێت؟ گەروا بێت ئەوا دەبوو میسرییەکان تا ئێستا ئەو نەریتەیان بهێشتایەوە کە خوشك و برا لە یەك حەلاڵ دەکات. دەبوو دوورگەی عەرەبی بەردەوام بوایە، لەسەر نەریتی ئەو خێڵانەی قورەیش بەر لەسەردەمی پێغەمبەر کچانیان زیندەبەچاڵ دەکرد و... هتد.

دەبینین بچووکترین سەرنجی مێژووی بەتاڵی و پوچی ئەو تێڕوانینە دەردەخات کە قسە لە خوسوسیاتی ئێمە دەکات، وەك سیفەتگەلێکی نامێژوویی کە لە ئەزەلەوە هەبووە و تا ئەزەلیش دەمێنێتەوە. هەڵەیەکی گەورەیە ئەوانەی قسە لە خوسوسیاتی ئێمە بەم لۆژیکە دەکەن، بە کەسانێك بزانین کە لە هەوڵی پاراستنی شوناسی جیاوازی ئێمەدان. ئەمانە لەدوی پاراستنی شوناسی ئێمە نین، بەڵکو لەدوی نامێژوویکردنی ژیانی ئێمە دەگەڕێن... بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن ژیانی ئێمە وەك بوونێکی مرۆیی بسڕنەوە و بیخەنە دەرەوەی مێژووەوە، لە واتە هەموو گۆڕان و تازەکردنەوە و پشکنینێکی تازەی مەحروم بکەن کە پێشمەرجی سەرەکی هەموو شوناسێکی زیندووە. خەمی ئەوانە شوناسی ئێمە نییە، بەڵکو پاراستنی کۆمەڵێ ماهییەت و سیفەتی دیاریکراوە کە ئەو جۆرە کەسانە بەرژەوەندییان لە پاراستنیدایە.

لە هیچ شوێنێکدا ئەم ڕاستییە هێندەی قسەکردن لە عەلمانییەت دەرناکەوێت، چونکە گەر عەلمانییەت لە جەوهەر و ناوەڕۆکدا بریتی بێت لە خاکیکردن و مرۆیکردنی دەسەلات و سەندنەوەی شەرعییەتی ئاسمانی لە دەوڵەت، ئەوا ئەو کەسانەی قسە لە خۆرئاواییبوون و نەگونجانی بۆ ئێمە دەکەن، ناڕاستەوخۆ دەیانەوێت پێمان بڵێن دەوڵەت لێرە شەرعییەتی

خۆی لە ئاسمانەوە دەهێنێت... دیاردەیەکی مرۆیی نییە و ئەو کەسانەش کە بە دەستیانەوەیە، دەستی خودایان لە پشتەو نوێنەری ڕاستەقینەی تەبارەکی تەعالان. دەیانەوێت پێمان بڵێن دەسەڵاتدارەکانی ئێمە سێبەری خودان لەسەر زەوی و ڕەخنەکردن و ڕەفزکردنیان، ڕاستەوخۆ بەمانای ڕەفزکردن و ڕەخنەکردنی خودای مەزن دێت... واتە کورت و موختەسەر قسەکردن لەسەر ڕۆژئاواییبوونی عەلمانییەت، دەچێتە بەرژەوەندی ئەو کەسانەوە کە دەسەڵات دەگرنە دەست و دەیانەوێت دوور لە چاودێری و ڕەخنەکردن و قبوڵکردنی بەرپرسیاری، هەرچییەکیان ویست بیکەن و کەسیش جۆرئەت نەکات لە گوڵ کاڵتریان پێ بڵێت، چونکە هەرچییەکیان پێ بڵێت بە دەوڵەتی خودا و سێبەرەکان و نوێنەرەکانی تەبارەکی تەعالای گوتووە.

دەبینن لەپشت قسەکردن لەسەر خسوسیات و ڕۆژئاواییبوون، چ مەحشەرێکی پڕ لە بەرژەوەندی بۆ ئەو کەسانە دەبرێتەوە کە ساویلکانە دەیلێنەوە و خەڵکانێکی بەستەزمانیش بڕوایان پێدەکەن و وەك کەسانێك دەیانناسن کە بەرگری لە شوناسی خۆماڵی دەکەن... غافڵ لەوەی ئەوی ئەوانە بەرگری لێدەکەن، نەك شوناسی ئێمە، بەڵکو کۆمەڵێ خەسڵەتی دروستکراو و نامێژوویيە کە ئەوانە بەرژەوەندییان لە پاراستنیدا هەیە. پێموایە عەلمانییەت و دیموکراسی و مافی مرۆڤ و کۆی ئەو چەمکە مۆدێرنانە، ئەزموونی مێژوویەکی دوورودرێژی مرۆڤگەلێکی وەك ئێمەن کە لە پاش مێژوویەکی خوێناوی پڕ لە نادادپەروەرییەوە و بۆ دۆزینەوەی باشترین فۆرمی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا پێی گەیشتوون...

ئێمە دەتوانین سوود لە هەموو ئەو ئەزموونە وەربگرین و گەر بەڕاستیش لە پاراستنی شوناسی خۆمان دەگەڕێین لەبری ڕەفزکردن و تورهەڵدانی، ئاسۆ و مانای تازەتری بۆ دابنێین و بە ئەزموونی ژیانی مێژووی خۆمان دەوڵەمەندتر و فراوانتری بکەین.

دڵەڕاوکێی شوناس لەبری ئەوەی بەرەو وەرنەگرتنی ئەو چەمکانەمان بەرێت، دەبێت بەرەو پشکنینی زیاتر و دۆزینەوەی گەورەتر و فراوانکردنی ماناکانی ئەو چەمکانەمان بەرێت. دەبێت بەرەو ئەوەمان بەرێت ئەزموونی مێژوویی خۆمان وا بەکاربهێنین کە تیشکی تازە بخاتە سەر ئەو چەمکانە و لایەنی نەگوتراو و شاراوە لەناویاندا بدۆزێتەوە. من بەتەواوی لەگەڵ وەرگرتنی سەر لەبەری ئەو چەمکانەدام، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نیم ئەو سیناریۆی ڕووداوانەی لەپشت داهێنانی ئەو چەمکەوە بووە، لێرەش بێ زیاد و کەم دووبارە بکەینەوە. مەرج نییە گەیشتنی ئێمە بە عەلمانییەت، بەهەمان ئەو سیناریۆی ڕووداوانە بڕوات کە ڕۆژئاوادا پیایدا تێپەڕیووە. هەروەها مەرج نییە دوژمنەکانیشی هەمان ئەو دوژمنانە بن کە لە ڕۆژئاوادا دوژمنایەتییان کردووە.

پێموایە ئالێرەدایە کە دەبێت حسابێکی ورد بۆ ئەو سیاقە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسییە بکەین کە ئێمە (نەك هیچ کەسێکی دی)، لەناویدا دەژی. ئالێرەدایە دەبێت ئەزموونی مێژووی خۆمان وەك پێوەرێك بۆ سیناریۆیەکی تازەی ڕووداوەکان وەگەڕ بخەین. بەکورتی دەبێت ئەوانەی دەیانەوێت بەناوی شوناسەوە ئێمە لە ئەشکەوتێکدا بژین کە جگە لە سەدای خۆمان گوێمان لە هیچی دی نییە، لەو ڕاستییە تێبگەن

که سوودوەرگرتن و قەرزکردنی چەمکێك چەند ڕۆژئاوایش بێت، بەمانای دووبارەکردنەوەی سیناریۆی ئەو ڕووداوە مێژووییانە نییە کە لەپشت دروستبوونی ئەو چەمکانەوەیە لە ڕۆژئاوا، بەڵکو بەمانای ژیانە لەناو جیهانێکدا کە تیایدا مرۆڤەکان ئەزموونی تایبەتی خۆیان بۆ دەوڵەمەندکردن و قوڵکردنەوەی بەردەوامی کۆی ئەو دەستکەوتانە بەکاردێنن، کە جیا لەیەك و لە شوێن و سیاقی جیاواز لەیەکدا بەرهەمیان هێناوە.

**شوان ئەحمەد: تۆ لە شوێنێکدا باس لەوە دەکەیت کە کێشەت لەگەڵ ئەو پێناسەیەدا هەیە کە پێی وایە عەلمانییەت بریتییە لە جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، بەڵکو داماڵینی پیرۆزی لە دەسەڵات بە گونجاوتر و لەبارتر دەزانیت. با ئەمە وابێت، بەڵام ئاخۆ ڕێگەدان بەوەی دینییەکان مافی سیاسەتکردنیان هەبێت و دەستکراوەبن لەوەی ئایین تێکەڵ بە سیاسەت بکەن، هەوڵێکی تر نییە بۆ بەخشینەوە و گەڕاندنەوەی پیرۆزی بۆ دەسەڵات؟**

**ڕێبین هەردی:** سەرەتا با قسە لەوە بکەم بۆچی من کێشەم لەگەڵ پێناسی عەلمانییەتدا وەك (جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت) هەیە. لێرەدا نامەوێت باسی ئەوە بکەم کە دین بە فۆرمی تازە و لە شکڵی تازەدا هەمیشە و هەمووکات لەگەڵ دەوڵەتی مۆدێرندا بووە. نامەوێت قسەی ئەو بیریارانەت بۆ بهێنمەوە کە هەر هەموویان باس لەبوونی ئەفسانەکان و موقەدەسات لە جیهانی مۆدێرندا دەکەن. باسی هیچ یەك لەم شتانە

ناکەم و تەنها ئەو هۆکارە تایبەتییانەت بۆ باس دەکەم کە لە مێژووی تایبەتی خۆمانەوە دێن و وایان لە یەکێکی وەکو من کرد، گومان لەو پێناسەیە بکەم، یان لایەنیکەم بەورییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەم.

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێم کە گومانی من لەو پێناسەیە لە دوژمن و نەیارەکانییەوە نەهات، واتە لەو کەسانەوە کە بڕوایان بەو پێناسەیە نەبووە و دژایەتییان کردووە، بەڵکو لەو کەسانەوە هات کە بانگەشەی ئەوە دەکەن و بڕوایان پێیەتی. سەرەتاترین شت ئەوەیە بینیم ئەوانەی ئەم پێناسەیەیان بەرزکردووەتەوە بەدوای خاکیکردنی دەسەڵات و مرۆیکردنیدا ناگەڕێن، بەدوای ئەوەدا ناگەڕێن دەسەڵاتدار بچێتە ژێر چاودێری خەڵك و بەرپرسیاری مرۆڤەکانەوە، بەدوای ئەوەوە ئەوەوە نین کە کەس بەناوی موقەدەساتەوە (جا ئەو موقەدەسە زەمینی بێت یان ئاسمانی)، حوکم نەکات و نەچێتە سەروو ڕەخنە و چاودێری خەڵکەوە... واتە بەدوای کۆی ئەو شتانەوە نین کە ئەوکەسەی بڕوای بە عەلمانییەت هەیە دەبێت جێبەجێی بکات، بەڵکو ئەم پێناسەیەیان بۆ لێدان و بێدەنگکردن و سەرکوتکردنی شەریحەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی دیاریکراو بەرزکردووەتەوە... بۆ ئەوە وەریانگرتووە مافی سیاسەتکردن و دەسەڵات گرتنە دەست، لە کۆمەڵێ هێزی دیاریکراو بسەنن... بۆ ئەوە بەرزکراوەتەوە وێنەیەکی ناڕاست و پڕ لە بێویژدانی، بەکەسانێکی هاوڵاتی خۆم ببەخشرێت، کە گوناهی گەورەیان ئەوەیە وەك من و تۆ بیر لە شێوەی بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کۆمەڵگا ناکەنەوە.

بینیم بەناوی عەلمانییەتەوە بەرچەسپی دواکەوتوویی و نەخوێندەواریی بە کەسانێکەوە دەلکێنن، کە خوێندکاری زانکۆی و ئەهلی کتێبن و بێئاگایانە قسە ناکەن... بینیم کەسانێك دەکرێن بە عەمیل و دەستی دەرەوە کە ئەستەمە بە ئاسانی گومان لە دڵسۆزی و پاکییان بکرێت... بینیم خەڵکێك دەکرێن بە درِندە و شمشێر بەدەست کە تاوانێکمان بە بەڵگەوە لەسەر نەسەلماندوون. بینیم بەناوی عەلمانییەتەوە خەریکی چاندنی رِق و کینەن، بەرامبەر بە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی خۆمان. واتە لە ساتێکدا هەستم کرد ئەوانەی ئەو پێناسەیەیان بەرزکردووەتەوە، لەبری ئەوەی بەرەو چاندنی گیانی لێبووردن و گێرِانەوەی حورمەت بۆ مرۆڤ پاڵمان پێوەنێن، بەرەو کوشتار و بێدەنگکردن و سوکایەتی پێکردنی شەریحەیەکی گەورەی هاوڵاتییەکانی خۆمان دەمانبەن. بەرەو ئەوە دەمانبەن گەر رِۆژێك ئەو کەسانە کوژران یان سەرکوتکران، لەبری دەنگی نارِەزایی بڵێین (ئۆخەی، رِزگارمان بوو لێیان).

من ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دان بەو هەڵە گەورەیەی خۆمدا بنێم کە لە شەرِی یەکەمی بزووتنەوەدا، لەو کەسانە بووم کە لەگەڵ خۆمدا وتم: (ئۆخەی رِزگارمان بوو لێیان). پێم وایە هەرگیز من خۆم لەسەر ئەو ئۆخەیە نابەخشم. وەلێ دەبوایە لەکاتێکدا لە خۆم بپرسم چی منی گەیاندە ئەوەندە بە ویژدانی رِاحەت و ئاسوودەیی و خەمساردییەوە، بە کوشتنی خەڵکانی شارێك بڵێم ئۆخەی کە رِەمزی میحنەتەکانی کوردە: هەڵەبجە؟ چۆن و لەپێناوی چیدا گەیشتمە ئەو حاڵەتەی پێم خۆشبێت، خەڵکانێکی ئەم شارە بکوژرێن و خێزانگەلێکی هەرگیز خێر

لەخۆنەدیو هەتیوبکرێن و دایکانێکی هەمیشە دەست بەدوعا بۆ هەتاهەتایە ڕەشپۆش بن. لە خۆم پرسی چی ڕێگەی لێگرتم بیر لە هەموو ئەم ڕەهەندە ئینسانیانە نەکەمەوە و بڵێم: (ئۆخەی کوژران و نەمان). بۆچی خەڵکانێکی زۆر کە بە هەموو تەمەنیان حەزیان لە بینینی تەرمێك نەبووە، بە گیانێکی ئاسوودە و ویژدانێکی ئارامەوە بە کوشتنی ئەو کەسانەیان وت (ئۆخەی)؟

لە یادت نەچێت قسەی من لەسەر لایەنگری نییە، قسەی من لەسەر ئەوە نییە ئایا ئەو کەسانەی لەو شەڕانەدا کوژران ڕاست بوون، یان نا: کێ ڕاستی کرد و کێ هەڵە؟ قسەی من لەسەر ئەم شتانە نییە، بەڵکو قسەی من لەسەر شتێکی ترسناکترە... لەسەر ئەو حاڵەتە ترسناکەیە کە مرۆڤەکان هەموو هاودەردییەکی خۆیان دەدۆڕێنن. لەسەر ئەو هەلومەرجە ترسناکەیە کە مردن و کوشتن هەموو ڕەهەندە ترسناکەکانی خۆیان ون دەکەن و بیر لە دەرەنجامە ترسناکەکانی ناکاتەوە. قسەی من لەسەر ئەوەیە بۆچی مرۆڤ و ژیانی ئەوەندە لامان بەنرخ نەبوو کە شایستەی ئەوە نەبێت لەسەر گۆڕەکەی بڵێین: (ئۆخەی).

من لەم ڕووداوانەدا دۆڕانی هەموو ئەو مانا و بەهایانەم دۆزییەوە کە ژێرخانی بنەڕەتی و سەرەکی عەلمانییەتە، واتە مرۆڤ و حورمەتی ژیان. لەبەر ئەوەش کە پێناسەی عەلمانییەت وەك (جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت) بەشێك بوو لەو تلیاکانەی لەو کاتانەدا ویژدانی هەموومانی سڕکرد (بەداخەوە تا ئێستاش ویژدانی زۆرکەسی سڕکردووە)، ئەوا ناچار بیرم لەوە کردەوە کە کێشەیەك لەم پێناسەیەدا هەیە. بیرم کردەوە پێناسەی

عەلمانییەت بۆ مرۆڤانەکردنی دەسەڵاتدارە، نەك بۆ دۆزینەوەی شەرعییەت بۆ کوشتنی خەڵکی دی.... بۆ بوونی دادپەروەری و لێبووردن و بێ لایەنکردنی دەوڵەتە لە عەقیدە جیاوازەکانی کۆمەڵگادا، نەك بۆ ئایدیۆلۆژیایەك کە لەڕێگەیەوە هێزێکی سیاسی بیەوێت هێزێکی سیاسی دیکە لەناوبەرێت.

بیرم کردەوە ئەو سیناریۆیەی ئەم مانایە لە ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ئێمەدا دروستی دەکات، دادپەروەری و مرۆڤخوازی و دیموکراسی نییە، بەڵکو شەڕ و کوشتارێکی گەورە و ڕەنگە نەبڕاوەی نێوان خۆمان بێت. کە سەیری مێژووی لەدایکبوونی چەمکەکەش لە ڕۆژئاوادا دەکەین، دەبینین عەلمانییەت لەوێ بۆ ڕاوەستاندنی کوشتاری مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا هات... بۆ ئەوە هات عەقیدەکان بەرامبەر بە یەك لێبوردووبن. بۆ ئەوە هات دەسەڵات دادپەروەر بێت و مافەکانی هاولاتی بەپێی دوور و نزیکی لە عەقیدەی دەوڵەتەوە نەپێوێت، کەچی عەلمانییەت لە واقیعی ئێمەدا بۆ دروستکردنی شەڕ و نەهێشتنی لێبووردن هاتووە... بۆ ئەوە هاتووە هێزێك شەرعییەتی لەناوبردنی هێزێکی دیکەی لێوەربگرێت. بیرم کردەوە عەلمانییەت لە ڕۆژئاوادا وەك چارەسەرێك بۆ کێشەی نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان هات، کەچی لای ئێمە بۆ نانەوەی کێشە لەنێوان هێز و گرووپە جیاوازەکان دێت. جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت لەبری ئەوەی بەرەو دیموکراسی و کرانەوە و لێبووردنمان بەرێت، بووە بە تلیاکی ویژدانی ئەو کەسانەی بە چەپڵەڕێزان و هەستکردن بە سەرکەوتنەوە تەماشای کارەساتی کوشتنی هاولاتییەکانی خۆیان دەکەن.

کەواتە پێناسەی عەلمانییەت وەك (جیاکردنەوەی دین لــە دەســەڵات)، لە واقیعی ئێمەدا پێویستی بە خستنە ناو کەوانەوە هەیـە، لایـەنی کـەم پێویستی بە وردکرنەوە و قوڵکردنەوەی زیاتر هەیە. پێویستی بـەوە هەیـە کە تێبگەین ئەم پێناسەیە بۆ ئەوە نەهاتووە ویژدانمان بخەوێنێت و هەموو هاودەردییە ئینسانییەکانمان بکوژێت و ئاسوودەمان بکات، بەرامبـەر بـە کوشتنی ئەندامانی هێزگەلێك کـە مەرجـەعی خۆیـان دەگەڕێننـەوە بـۆ دین، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە دەوڵەت و دەسەڵاتدار شەرعییەتی خۆیـان لـە موقەدەساتەوە وەرنەگرن، بە سەودای چوونە سەر و چاودێری و ڕەخنەگرتن و لابردنەوە. عەلمانییەت، واتـە قبـوڵکردنی لێپرسـینەوەی دەسـەڵاتدار و تەنانەت گۆڕینی و ڕەخنەکردنی، واتە دژایەتی نەکردن و نەکوشـتنی ئـەم چاودێر و لێپرسینەوەیە بەناوی ئەوەوە کە هەڵوێستی نەیار لـە دەوڵـەت، هەڵوێستی نەیاربێت بەرامبەر بە خـوا و فـەرموودەکانی... بـە مـەعنای ئەوەیە ڕەخنەکردنی دەسەڵات ئەگەر مەرجەعەکەی دینیش بێت، بەمانای ڕەخنەگرتنی خودا و ڕێبازی خودا و ڕێبازی خودا نییە، بەڵکو بـە مانـای لێپرسینەوە و ڕەخنەکردنی مرۆڤگەلێکە کە ئەگەر فەرمودەکانی خـودا و پێغەمبەرانیشیان لەبـەر بێـت، لـەوە ناکـەون مـرۆڤ بـن و وەك هـەموو مرۆڤێکـی دی لەبـەردەم ئەگـەری هەڵەکردنـدا بـن. ئەمانـە مانـا ڕاسـتەقینەکانی عەلمانییـەتن. لەبەرئـەوە لـە شـوێنێکدا گـوتم ڕەنگـە داماڵینی پیرۆزی لە دەسەڵات، پێناسێکی باشـتر بێـت بـۆ عەلمانییـەت و زیـاتر لـەو پێناسـەی دی دوور بێـت لـە تەمومـژ و گەمـە پێکردنـی ئایدیۆلۆژییەوە.

سەبارەت بەوەش کە ئایا مافی سیاسەتکردن بە دینییەکان ڕێگر بێت لە پڕۆژەی داماڵینی پیرۆزی لە دەسەڵات، ئەوا زیاد لە سەرنجێکم هەیە. جارێ پێم وایە مرۆڤ دینی بێت یان نەبێت، کافر بێت یان موسڵمان، مافی سیاسەتکردنی هەیە و کەسیش بۆی نییە ئەم مافەی لێ بسێنێت. من بڕوای تەواوم بە بەندەکانی مافی مرۆڤ هەیە و دەشزانم یەکێك لە بەندەکان، مافی سیاسەتکردن بە هەموو مرۆڤێك دەدات: چ دینی بێت یان نەبێت. واتە من مافم پێ نەداون، بەڵکو ئەوە مافێکی سروشتی خۆیانە و تەنهاش سیستمە تۆتالیتارییەکانن کە دەستنیشانی ئەوە دەکەن چ کەسێك مافی سیاسەتی هەیە و چ کەسێك نییەتی.

مرۆڤە دینییەکان تەواوی ئەو مافەیان هەیە کە هەموو مرۆڤێکی دی هەیەتی. ئەو کەسەشی عەقیدەی مرۆڤێك دەکات بە بنەما بۆ ناسین و سەلماندنی مافەکانی، هێشتا هیچ لە ئەلفوبای دیموکراسییەت نازانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایا ڕاستە گرووپە دینییەکان پیرۆزیی بە دەسەڵات دەبەخشن؟ ئایا ڕاستە ئەوان تاکە هێزێکن کە ئەم کارە بەئەنجام دەگەیەنن؟ ئایا هەر هێزە دینییەکان کە دەسەڵاتیان پیرۆزکردووە و بەم کارەش خستوویانەتە سەروو ڕەخنە و گۆڕانکاری و مەرجەکانی دیموکراسییەوە؟

هەست دەکەم هەر سەیرکردنێکی سەرپێیی ئەوە ئاشکرا دەکات، هێزێك لە کوردستاندا نییە دەسەڵات و بنەماکانی خۆی نەخستبێتە سەروو ڕەخنە و مەرجەکانی دیموکراسییەوە.... هێزێك نییە مل بۆ گۆڕانکاری و لێپرسینەوە و چاودێری خەڵکی بدات. تۆ تەماشای

کوردستان بکە، بزانە بۆ جارێکیش دادگاکانی ئێمە لێپرسراوێکی گەورە یان بچووکی چووە بەردەست کە بەتۆمەتێك لە تۆمەتەکان گیرابێت؟ بزانە لێپرسراوێك بۆ جارێکیش، پەرژەوەندی دارایی هەڵدرایەوە و لێی پرسرا (من این لك هذا)؟ ئەی هیچ هێزێك ڕێگەی لێگیرا یان لابرا یان خرایە بەردادگا کە بێ گەڕانەوە بۆ بڕوای خەڵکی، پەلاماری ئەم هێزی یان ئەو هێزی سیاسی دابێت؟ ئایا کەس لە کوشتن یان گرتن یان سەرکوتکردنی فلان و فیسار کەسدا، داوای لەم هێزانە کرد ڕوونکردنەوە بدەن و گەر حوجەتەکەشیان لاواز بوو باجی ئەو هەڵەیەی لێبسێنن؟ چ دەڵێی براکەم! هێزەکانی ئێمە هەر هەموویان خۆیان پیرۆزکردووە و خۆیان خستووەتە سەروو ڕەخنە و چاودێری خەڵکەوە.

ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا لەژێر مایکرۆسکۆبدایە هێزە سیاسییەکان نین کە بە مەیلی خۆیان چیان ویست دەیکەن، بەڵکو ئەو کەسانەن کە ڕەخنەیان لێدەگرن و داوای چاودێریکردنیان دەکەن. ئەگەر مەسەلەکەش داماڵینی پیرۆزییە لە دەسەڵات، ئەوە نە ویژدان و نە دادپەروەری و نە ئازادیخوازی ڕێگەی ئەوەمان نادات، خەڵکانێك لە مافی سیاسەتکردن بە بەهانەی خەوشێك داماڵین، کە ئەو خەوشە لە هەموو هێزەکانی دیدا هەیە.

ئەگەر حوجەتی ئێمە بۆ بەخشینی مافی سیاسەتکردن ئەوەبێت، کە ئەمجۆرە کەسانە دەسەڵات پیرۆز دەکەن و دەیخەنە سەروو ڕەخنەوە، ئەوا دەبێت ئەم حوجەتە بۆ سەرلەبەری هێزە سیاسییەکانی کوردستان بە دینی و نادینییەوە بەکاربێنین. پێم وایە لەو کاتەشدا ڕەنگە هێزێك لە

کوردستاندا نەمێنێت کە مافی سیاسەتکردنی هەبێت، چونکە تۆ بۆخۆت دەزانــی موقــەدەس تــەنها لــە پەرتووکــەکانی خــودا و فــەرمودەکانی پێغەمبەرەوە نایەت، بەڵکو لەو تێکست و تێزە زەمینییانەشەوە دێت کـە جێگەیەکی پیرۆزیان لە فەنتازیای لایەنگرانیدا داگیر کـردووە. مــەوقیعی مانیفێسـت لــە فــەنتازیای کۆمۆنیســتەکاندا، هــەر هــەمان مــەوقیعی قورئانــە لای ئیســـلامییەکان. ئـــەو هەڵوێســـتە تونــدڕەو دۆگمایـــەی کۆمۆنیستەکان والیێدەکات گوێ لە یەك ڕەخنە نەگرن و بەتوندی هێـرش بکەنــە ســەر نەیارەکــەیان، هــەمان ئــەو هەڵوێســتەی ئیســلامییەکانە بەرامبەر بە ڕەخنەگرانیان...

ئەو هێزانەی بە ناوی ڕاستی و عەلمانییەت و هاوچەرخبوونەوە خۆیـان کردووەتــە نوێنــەری ڕاســتەقینەی ئــەو چــەمکانە، هــەر هێنــدەی ئیسلامییەکان لە موقەدەساتدا غەرقبوون کە خۆیان بە نوێنــەری خـودا دەزانن! تۆ لە یادتە یەکێك لە کادیرە بەتەمەنــەکانی ئـەم حیزبانــە کـە تــازەش لــە ڕۆژئــاوا گــەڕابووەوە، چــۆن لەبــەردەم گــەورەترین دەســەڵاتی حیزبەکەیدا بەئاشکرا گوتی ئەوەی ڕەخنە و قسە بە هێزەکــەمان دەڵێــت، واتە قسە بە کورد و کوردستان دەڵێت... ئاخر جیاوازی ئەمە لەگــەڵ ئــەو ئیسلامییەدا چییە کە دەڵێت ئەوی لەگەڵم نییــە، واتــە لەگــەڵ خــودا و قوئاندا نییە؟! لە فانتازیای عەلمانییەکاندا جێگەی ئەو کەســەی لەگــەڵ وڵاتدا نییە و دژێتی، هەمان جێگــەی ئــەو کەســەی لای ئیســلامییەکان هەیە کە دژی خودا و قورئانە!

لەلایەکی دیەوە، ئەو کاتەی ئێمە ئەم قسانە دەکەین، لە تەنیشت خۆمانەوە هێزێکی دینی حوکم دەکات کە بەردەوام لێپرسراو و بەرپرسیارەکانی خۆی ڕەوانەی دادگا دەکات! لە سەردەمی حوکمکردنی خاتەمیدا کە ئیسلامییە و حوجەتولئیسلامە، دەسەلاتدارێکی زۆرمان بینی بۆ دادگا ڕاکێشران و پرسیاریان لێکرا...

لەو سیستمەدا کە دینییە، خۆپیشاندانێکی گەورە دژی ڕژێم لە زانکۆکاندا بەرپاکرا و پاسدارانی والێکرد تەقە لە حەرەمی زانکۆ بکەن و هەندێك خوێندکار شەهید، یان بریندار بکەن... لەگەڵ ئەوەشدا لە خۆپیشاندانەکاندا چەندان دروشمی دژ بە ڕژێم بەرزکرانەوە، بەلام ئەمە ڕێگەی لەوە نەگرت بەرپرسیاری ئەو ڕووداوانە لە پاسداران بخرێنە بەر دادگا و وابزانم تا هەنوکەش گیراون... یەکێك لە گیراوەکان بەرپرسیاری سەربازیی تارانە. وەلێ لە دەسەلاتی بەناو عەلمانی ئێمەدا کە گوایە بڕوای بە عەلمانییەت هەیە، چەندان خۆپیشاندان درانە بەرتەقە و خەڵکیان تیا شەهیدکرا، بێ ئەوەی سەربازێکی بچووك ببینن بدرێت بە دادگا. هەر بۆ نموونە لە خۆپیشاندانەکەی دژ بە ڕووخانی خانووەکانی حامیەی سلێمانی، شاعیرێك کوژرا و کەسیش لە بەرامبەر کوشتنیدا دادگایی نەکرا. لە ١٣ی حوزەیرانی سەرەتای نەوەدەکاندا و لە خۆپیشاندانەکەی لایەنگرانی پارتیدا، چەندان کەس کوژران و بریندار بوون، کەچی بۆ جارێکیش پەرژەوەندی ئەو ڕووداوە هەڵنەدرایەوە و پرسیار لەو پۆلیس و سەربازانە نەکرا کە تەقەیان کرد و ئەو لێپرسراوەش ڕەوانەی دادگا نەکرا کە فەرمانی تەقەکردنی پێدابوون!

نەك هەر ئەوە، بەڵكو لەمە تراژیدی تر تەنانەت یەك ڕۆژنامەش باسی نەكرد و هەواڵەكەی بڵاو نەكردەوە و ڕیپۆرتاژێكی لەسەر ساز نەكرد. لەكاتێكدا لە ڕوودانی خۆپیشاندانی خوێندكارانی زانكۆی تاراندا، هەر هەموو ڕۆژنامەكان بە دەوڵەتی و نادەوڵەتییەوە سەرقاڵی تاوتوێكردنی بوون، ڕیپۆرتاژیان لەبارەوە ساز دەكرد و دەیان وێنەی پێكدادانەكانیان بڵاو دەكردەوە... هەندێك بە لایەنگری خۆپیشاندانەكە و هەندێكی دی بە لایەنگری دەستدرێژیی پاسدارەكان.

تەماشاكە تراژیدیاكە چەند گەورە و ترسناكە! لە تەنیشت خۆمانەوە كە دەوڵەتی ئیسلامی حوكم دەكات چی ڕوودەدات و چ شەفافییەتێك كەوتووەتە گەڕ، لە حوكمی بەناو عەلمانییەكانی خۆشماندا چ تاریكی و بێدەنگی و لێ نەپرسینەوەیەك لە ڕووداوەكاندا پەیڕەو دەكرێت. سەیری كۆنگرەی نەك هەر حیزبەكان، بەڵكو ئەو ڕێكخراوانەش بكە كە سەر بەم حیزبانەن، بزانە چ جۆرە هەڵبژاردنێكی ناشیرین لەناویاندا بەڕێوە دەچێت... سەرۆك و سكرتێر هەرگیز ناچنە ناو ململانێ لەگەڵ هیچ هەڵبژێردراوێكی دیدا، هاوكات بێئەوەی بۆ جارێكیش كارنامەی چەند ساڵیان بخرێتە بەر تەتەڵەكردن، بە چەپڵەڕێزان هەڵدەبژێردرێنەوە... خۆ هەر دوێنێ بوو هەواڵی كۆنگرەی ڕۆژنامەنووسان بڵاوبووە، كە تیایدا یەك كەس خۆی بە نەقیب هەڵبژارد و كەسی دی لە بەرامبەر خۆیدا نەبینی، لەبەرئەوە خۆبەخۆ و بەكۆی دەنگ كرا بە نەقیبی ڕۆژنامەنووسان... بە تەزكیە هەندێك سەر بە حیزبە كوردستانییەكان بوون بە ئەندامی ئەنجومەن و هەڵبژاردنیش كۆی ستافی ڕاگەیاندنی یەكێتیی بردیانەوە.

تەماشای ئەم گەمە ناشیرینانە بکە لە ولاتێکدا کە بەحساب بەدەست عەلمانییەکانەوەیە و بەراوردی بکە بە هەلومەرجی ئیسلامییەکانی ناو ئێران، تەماشای ئەو هەموو ناکۆکی و جیاوازی بیروبۆچوونە بکە کە بە شەفافییەت لەناویاندا سەریهەڵداوە. تەنانەت ولایەتی فەقیهیش کە گەورەترین دەسەلاتی شەرعییە بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنێك دەبێت کە ناوی مەجلیسی خوبرەگانە، هەر ئەو مەجلیسەش دەسەلاتی ئەوەی هەیە گەر وەلی فەقیه لە ئاستی پێویستدا نەبوو لایبەرێت. وەلێ دەسەلاتێکم لەم بەناو عەلمانییانەی کورد بدەرێ کە بتوانێت سکرتێر و سەرۆك بخاتە ژێر پرسیار و چاودێریکردن، ئەوەش نا، بەڵکو بچنە بەر ئەندامەکانیان و کارنامەیان بخرێتە بەرپرسیار.

دەبینی مەسەلەکان بەو سادەیە نین کە هەر مێزەر بەسەرمان بینی بیری موقەدەساتمان بکەوێتەوە، هەر چاکەت و پانتۆڵ لەبەرێکیشمان بینی قسە لە عەلمانییەت بکەین. مەسەلەی عەلمانییەت مەسەلەی جلوبەرگ و دروشم و ئایدیۆلۆژیا نییە، بەڵکو کۆمەڵێ کردار و رەفتاری عەمەلی و دیاریکراوە. من لە کۆڕی ئیسلامییەکانی لەمەڕ خۆماندا کادیرم بینیوە هەڵساوە رەخنەی لە قسەکانی بەرپرسی گەورەتر لەخۆی گرتووە، بەلام یەك جاریش ئەندامی هێزە عەلمانییەکانم نەبینی لە کۆڕێکی ئاشکرادا رەخنە لە لێپرسراوێکی گەورەتر لەخۆیان بگرن.

عەلمانییەکانی ئێمە کەناڵێکی دزێویشیان بۆ ئەم بێدەنگی و قسەنەکردنە دۆزیوەتەوە، ئەویش ئەو بەندەی پەیڕەوپرۆگرامە کە رەخنەکانی ئەندامانی تەنها لە کۆمەڵێ کەناڵی نادیار و نەبینراودا

زیندانی کردووه. تۆ لەیادتــه ئــەو ئەندامــە حیزبیانــەی لەگــەڵ ئێمــەدا بەیانێکی ناڕەزاییان ئیمزاکردبــوو، لەبەرچــاوی ئێمــەدا چــۆن هەڕەشــەی سزادانیان لێکرا! من لە کۆڕی ئیسلامییەکانی لەمەڕ خۆمانــدا کــادیری ئیسلامیم بینیوە کە هێرشێکی ناڕەوا کراوەتە سەر عەلمانییەت، بــەرگری لە عەلمانییــەت لــە بەرامبــەر ئیســلامییەکی دیــدا کــردووە، بــەڵام بــۆ جــارێکیش نــەمبینی کــادیری یــەکێك لــەم هێــزە عەلمانیانــە لەبــەردەم بێویژدانی کادیرێکی دیاندا بەرگری لە ئیسلامییەکان بکات.

ئەوکەسانەشی هەموو ئەم شتانە فەرامۆش دەکەن و دەڵێن هیچ نییە، پێموایــە لــەبری بیرکردنــەوەی عــەقڵانی بەشــێوەیەکی خێڵایــەتی و عەشایریانە بیر دەکەنەوە... واتە بڕیارەکانیان بەپێی سڵەی ڕەحم و لەســەر سیقەی هاوڕێیانە، نەك بەپێی چاودێریکردنی دراوە واقیعییەکان. من لەو کەسانە نیم بەپێی مەنتیقی عەشایەری و ئینتمای کوێرانە حوکم لەســەر شتەکان بدەم، بەڵکو بەپێی ئەو دراوە واقیعییانە قسە دەکــەم کــە لەبــەر دەست و چاومدا ڕوودەدەن. پێشموایە لەپشــت بچــووکترین ڕووداویشــەوە، دەیان تەڵە و ئینزاری ســەوز و ســوور هــەن کــە دەبێــت زۆر بەوردییــەوە تەماشایان بکەین و بیانبینین!

**شوان ئەحمەد: ئایا هەوڵدانی هێزە عەلمانییەکان لە واقیعی ئێمەدا بۆ جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت بە چ مەبەستێکە، بــۆ ئەوەیــە ڕێگــە لــە تۆتالیتارییەتی دینی بگرن، یاخود بۆ ئەوەیە بتــوانن لــەڕێی دەوڵەتــەوە**

**کۆنترۆڵی ناوەندە ئاینییەکان بکەن و ئەو دامودەزگایانە بهێننە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خۆیانەوە؟**

**ڕێبین هەردی:** بێگومان نەخێر! (جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت) لای ئەم هێزانەی ئێمە بۆ خاکیکردنی دەسەڵات و دیموکراتیزەکردنی و خستنە ژێر چاودێرییەوە نەهاتووە، بەڵکو بۆ لێدان و کەنارگیرکردنی کۆمەڵێ هێزی سیاسی هاتووە کە هەڕەشەی دەسەڵات گرتنە دەستیان لێدەکات. کێشەی عەقیدە و بیروڕا نییە، بەڵکو کێشەی ئەوەیە کێ دەسەڵاتی بەدەستەوە بێت. هێزە بەناو عەلمانییەکانی ئێمە هەموو نەریت و عاداتی ئیسلامییەکانیان دەوێت، بەو مەرجەی خۆیان نوێنەری بن. ئەوان دەیانەوێت لەبری ئیسلامییەکان خۆیان نوێنەری ئەو کولتوورە بن، نەك ئەوەی لە بنەڕەتدا کێشەیان لەگەڵ ئەو نەریت و تێگەیشتنانەدا هەبێت.

من لە شوێنێکی دیدا گوتوومە عەلمانییەکانی ئێمە، لە ئیسلامییەکان زیاتر سەرقاڵی مزگەوتکردنە و تەکیە دروستکردن و مەلا دروستکردنن بۆخۆیان. هەنوکە هەر هێزە کۆمەڵێ مەلای دینی سەربەخۆی هەیە. لە موناسەبە دینییەکاندا ئەوان لە ئیسلامییەکان دینیتر دەبن. واتە کورت و موختەسەر ئەمان هەموو کولتووری ئیسلامیان دەوێت، بەڵام بەو مەرجەی لە دەوری خۆیان خڕبنەوە. کردنەوەی ئەم هەموو مزگەوتە لەم شارەدا بەراورد بکە بە هەلومەرجی کتێبخانەی گشتی لەم شارەدا. لەدوای ڕاپەڕینەوە کەس هەولێدا چەند کتێبخانەیەکی تر کە دەوڵەمەندە بەدەیان سەرچاوەی تازە لە گەڕەك و کۆڵانەکاندا بکاتەوە... ئەمڕۆ کێ هێندەی بەناو عەلمانییەکان دژایەتی کۆی ئەو

دەستکەوتە فیکری و فەلسەفییانە دەکەن کە گوایا ڕۆژئاوایین. کێ هێندەی ئەوان قسە لەسەر خسوسیاتی ئێمە و کۆی ئەو بۆچوونانە دەکات کە لە جەوهەردا دەبێت میراتی ئیسلامییەکان بێت. کێ باسی بێگانەبوونی ئەم تێز و ئەو تێزە دەکات هێندەی کادیرە بەناو عەلمانییەکان؟ کێ لە وەرگێڕان و نووسینی بیریارە گەورە و ناودارەکانی دنیا، هێندەی عەلمانییەکان هەلاّی لێهەڵدەستێ؟ کێ باسی ئەشی و ناشێی تێزە تازەکانی فیکر و فەلسەفە لە کوردستاندا، هێندی عەلمانییەکان دەکات؟ پڕ ئاشکرایە هێزە عەلمانییەکانی ئێمە نامۆن بە جیهانی تازە و کار بۆ داخران و دۆگمایبوونی تێزەباوەکانی ڕۆشنبیری کوردی دەکەن و لە هەموو کرانەوەیەکی ڕاستەقینە دەترسن... واتە بەکۆی ئەو شتانە نامۆن کە ژێرخانی سەرەکی عەلمانییەتە، وەك جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت.

ئەوان کێشەیان لەگەڵ کولتووری ئێمەدا نییە و بیر لە گۆڕان و کرانەوەی زیاتری ناکەنەوە، بەڵکو کێشەیان ئەوەیە جگە لە خۆیان کەسی دی نەبێت بە نوێنەری ئەو کولتوورە. دەنا بە عەقڵدا دەچێت هێزێك عەلمانی بێت و کادیرێکی بڵێت دژایەتی هێزەکەم دژایەتیکردنی کوردستانە. بە عەقڵدا دەچێت باسی دیموکراسیەتی سوید و ئێرە بکات و بڵێت جیاوازە لەیەکدی. قسە لە بێگانەبوونی تێزەکان بکات و بڵێت لەگەڵ خسوسیاتی ئێمەدا ناگونجێت، (وەك ئەوەی عەلمانییەت لە قەرەجاوا سەری هەڵدا بێت، نەك لە ڕۆژئاوا)! بەعەقڵدا دەچێت لەبری چاککردن و دەوڵەمەندکردنی مامۆستای زانکۆی لەڕێگەی ناردنیان بۆ دەرەوە و

تێکەڵکردنیان بە زانکۆکانی دی دنیا، تەکیە و خانەقا بکەنەوە... لەبری بیرکردنەوە لەو هێزە خوێندەوارەی لەم وڵاتەدا کەس نییە لێیان بپرسێتەوە و چالاکیان بکات، سەرقاڵی ڕێکخستنی مەلا و قەدەغەکردنی پیشاندانی ماچ بێت لەسەر تەلەفیزیۆن... بەعەقڵدا دەچێت لەبری کردنەوەی کتێبخانەی زیاتر و زیاتر، سەرقاڵی مزگەوتکردنەوە و ڕاپۆرت نووسی تایبەت بەخۆی بێت... بە عەقڵدا دەچێت لەبری کرانەوە و دیموکراتیزەکردنی زیاتر، ڕۆژ بەڕۆژ دەرگاکانی خۆیان زیاتر بەسەر هەموو ڕەخنە و بۆچوونێکدا دابخەن.

تۆ سەرنجی ئەوەت داوە جگە لە پارتی، کەسیان جورئەتی پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی ڕاستەوخۆیان نییە لە تەلەفزیۆنەوە. سەرنجت داوە گەر بەرنامە و قسەکانیش بەدڵی ئەوان نەبوو، ڕێگە لە بڵاوکردنەوەی دەگرن. دەبینی لەناو ڕۆژنامەکانیاندا جگە لە مەدح و سەنا، هیچی دیکەیان بۆ بڵاو ناکرێتەوە و کە وتارێکیش بڵاودەکەنەوە دەبێت بە چ هەرایەك لەناویاندا. دەبینی چۆن سەرقاڵی دژایەتیکردنی سەرمایەی ڕەمزی ئەو ڕۆشنبیرە عەلمانییانەن کە قسە و ڕایەکی جیاواز لەوانیان هەیە، ئەمەش بە قازانجی سەرمایەی ڕەمزی کۆمەڵێ مەلای تاریك دەشکێتەوە. ئێ هەموو ئەم شتانە مەحەکی ئەوەن کە ئایا دین لە دەوڵەت جیابووەتەوە یان نا، چونکە هیچ جیاکردنەوەیەکی دین لە دەوڵەت بێ پڕۆژەی دیموکراسی بوونی نییە. جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت درۆیەکی گەورەیە، گەر بە مانای دیموکراتیزەکردنی دەسەڵات و لێپرسینەوە و خستنە ژێر چاودێرییەوە نەبێت. گەر بەمانای مرۆڤانەکردنی دەسەڵات

نەبێت. مرۆڤانەکردنی دەسەڵات بە مانای ئەوە دێت، دەسەڵاتدار مرۆڤە و نە نوێنەری خوایە و نە نوێنەری هەقیقەت، تا کەس نەوێرێت ڕەخنەی بکات. عەلمانییەت دەربڕینێکی دیکەی دیموکراسییە، بەڵام لەو فۆرمەدا کە دەوڵەت وەریدەگرێت. وەك چۆن کۆمەڵگەی مەدەنی دەربڕینێکی دیکەی هەمان دروشمە، بەڵام لەو فۆرمەی کۆمەڵگا وەریدەگرێت.

**شوان ئەحمەد: بەڕاست هێزە عەلمانییە کوردییەکان هێزی عەلمانین؟**

**ڕێبین هەردی:** بێگومان ئەم هێزانە بە هیچ شێوەیەك عەلمانی نین، چونکە عەلمانییەت بەمانای ئەوە نییە تەنها ئەو هێزانە مافی دەسەڵاتگرتنە دەستیان هەیە کە مەرجەعەکەیان دینی نییە. لە ڕۆژئاوادا دەیان هێزی سیاسی هەن کە مەرجەعی سەرەکییان دینی مەسیحییە و پێیان دەڵێن دیموکرات مەسیحییەکان. هەڵوێستوەرگرتن نییە لە دین کە عەلمانییەت دەستنیشان دەکات. پرسیارەکە ئەوە نییە ئایا ئەوەی حوکمی بەدەستە دینییە یان نا، مەرجەعەکەی دینە یان تێکستێکی زەمینی. بە پرۆژەگەلێك کار دەکات کە مولهیمن لە تێکستە پیرۆزەکانەوە یان بە پرۆژەگەلێك کە لە داهێنانی مرۆڤە. ئەمانە هیچیان پەیوەندی بە عەلمانییەتەوە نییە، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە ئایا شەرعییەتی دەوڵەت لە کوێوە دێت؟ لە خوا و تێکستگەلێکی نەگۆڕەوە یان لە مرۆڤەکانەوە؟ دەوڵەتیش مولتەزیمە بە چییەوە؟ بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوداوە، یان جێبەجێکردنی خواست و ویستی خەڵکییەوە؟ ئەم شتانەن کە عەلمانی بوون، دەستنیشان دەکەن.

ئەوانەی عەلمانییەت تەنها وەك ئایدیۆلۆژیایەك بەكاردەهێنن كە بەكەڵكی سەندنەوەی مافی سیاسەتكردن و حوكم گرتنە دەستە لە هێزە دینییەكان، بێئاگان لەوەی خەریكی كۆپیكردنەوەی سیناریۆی ئەو ڕووداوانەن كە بەر لە چەند سەدەیەك لە ڕۆژئاوادا ڕوویدا و بووە ژێرخانی سەرهەڵدانی چەمكی عەلمانییەت. لە ڕۆژئاوادا پێناسی عەلمانییەت بۆیە وەك جیاكردنەوەی دین لە دەسەڵات كرا، چونكە تا سەردەمێكی دووردرێژ شەرعییەتی ئیمپراتۆر لە خوداوە دەهات... ئەو سێبەری خودا بوو لەسەر زەوی و هەڵوێستوەرگرتنیش لەو لە هەمان كاتدا هەڵوێستوەرگرتن بووە خودا. لەلایەكی دیەوە پاش دروستبوونی مەزهەبی پرۆتستانت، ئەو جەنگە خوێناوییانەی لەگەڵ كاسۆلیكەكاندا ڕوویاندا و دەوڵەتیش تا بینەقاقا تیایاندا غەرق بووبوو. چەمكی جیاكردنەوەی دین لە دەوڵەت بۆ ئەوە هات كە دەوڵەت لەم جیاوازییە مەزهەبییانە بێلایەن بكات و لە بەرژەوەندی یەكێكیان مافەكانی ئەوی دییان نەخوات.

بەڵام ئەمە سیناریۆیەكە تایبەت بە مێژووی پەرەسەندنی ڕووداوەكانی ڕۆژئاوا و قابیلی گواستنەوە نییە بۆ شوێنی دی. ئەوەی قابیلی گواستنەوەیە ناوەڕۆك و ئاڕاستەی ماناكانی پێناسەیەكە، نەك سیناریۆی ئەو ڕووداوانەی لەپشتییەوە ڕاوەستاون. ناوەڕۆكی ئەو مانایەش بوونی دەوڵەتێكی بێلایەنە، لە عەقیدە و بیروڕا جیاوازەكانی كۆمەڵگادا. بەو مانایەی لە بەرژەوەندی هیچ بیروڕایەك ئامادە نییە بیروڕایەكی دی سەركوت بكات، تەنانەت گەر لەگەڵ بیروڕای دەسەڵاتدارانیشدا

نەگونجێت. هەروەها بریتییە لە دروستکردنی شەرعییەتێکی تازە بۆ دەوڵەت کە لەبری هەقیقەت و خوداو موقەدەسات، لە جەماوەرەوە دێت.

ئەزموونی مێژووی خۆمان یەك ڕاستی دەسەلمێنێت، ئەویش ئەوەیە هەڕەشە لە دروستکردنی دەوڵەتی عەلمانی (بەپێچەوانەی مێژووی ڕۆژئاواوە) لەو هێزانەوە نەهات کە مەرجەعی سەرەکییان دینە، بەڵکو لەو هێزە ئایدیۆلۆژیانەوە هات کە دەیانویست کۆی ژیانی تایبەتی و گشتی پڕکەن لە سەدا و دەنگی خۆیان. واتە هەڕەشە لە عەلمانییەت لە سیستمە تۆتالیتارە ئایدیۆژییەکانەوە هات، نەك لە هێزە دینییەکانەوە. "ئالان تۆرین" لە کتێبی (دیموکراسییەت چییە)دا دەڵێت: (ئەوەی سیستمە تۆتالیتارەکان بەدیاریکراوی جیادەکاتەوە، بریتییە لە لەناوبردنی عەلمانییەت بەناوی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراوەوە، کە بەسەر کۆی ژیانی تایبەتی و گشتیدا دەسەپێنرێت). (الان تورين: ماهي الديمقراطية. ت: حسن قبيسى. دار الساقي. الطبعة الاولى، ١٩٩٥ ص ١٣٢). واتە ئەوەی هەڕەشە لە عەلمانییەت دەکات تەنها ئەو کەسانە نین کە شەرعییەتێکی خودایی بە دەوڵەت دەبەخشن، بەڵکو ئەو هێزە ئایدیۆلۆژیانەشن کە ماناکانی هەقیقەت پاوان دەکەن و بەسەر خەڵکانێکی زۆردا دەیسەپێنن و ڕێگە بە بوونی شێوازی تری هەقیقەت نادەن.

ئەو هێزانە دژی عەلمانییەتن، ئەو هێزانەن کە ئامادە نین بچنە ژێر چاودێری و لێپرسینەوەی خەڵکییەوە و هەموو ڕەخنەگرێکیان، بە دەیان تۆمەتی ترسناکی وەك خائین و دژی نیشتمان تاوانبارکردووە و دوژمنەکانی نیشتمانیشیان کورتکردووەتەوە بۆ دوژمن و نەیارەکانی

خۆیان. هەر ئێستا لە کوردستاندا زۆربەی هێزە سیاسییەکانی ئێمە و ڕەنگە ڕاستتریش بێت بڵێم زۆربەی کادیرە سیاسییەکانیان (چونکە لە ڕاستیدا کادیری کراوەشیان هەیە و دەبێت بە ویژدانەوە بیانبینین و بە ڕەنگی ئەوانی دی تەماشایان نەکەین)، هەموو بەرژەوەندی کورد و کوردستانیان کورتکردووەتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان. تۆ لە یادتە چۆن ئەو کادیرە سیاسییە بەتەمەنەی ماوەیەکە لە ڕۆژئاوا گەڕاوەتەوە، لە بەرامبەر ڕەخنەکردنی هێزە سیاسییەکەیدا باسی ئەوەی دەکرد ئەمانە ئەمنی قەومیان خستووەتە بەر مەترسی!! لەیادتە لە زنجیرە وتارێکدا ئەمنی قەومی کوردستانی کورتکردبووەوە بۆ ئەمنی حیزبەکەی. ئیدی تۆ تەماشای ئەم کۆمیدیایە بکە! ڕەخنە لەهەنگاو یان فلان بڕیاری هێزێکی سیاسی دەگرێت، باسی ئەوە دەکەن ئەمنی قەومیمان خستووەتە مەترسییەوە، بەڵام هێزە سیاسییەکان چەندین جار لەشکری بێگانە بۆ کوردستان پەلکێش دەکەن، کەچی دەڵێن ئەمنی قەومی دەپارێزین. چۆن هێزگەلێك ئەمە عەقڵییەتی کادیرەکانی بێت و بەئاشکرا لە ڕاگەیاندنەکانی ئەوانەوە بڵێت و کەسیش وەڵامی نەداوەتەوە تا بزانین ئەوە ڕای تایبەتی خۆیەتی، نەك هی حیزب، دەتوانین بە عەلمانی بزانین.

من لەو بڕوایەدام (هیواداریشم لەو بڕوایەدا هەڵەبم)، گەر هەندێك قسە و وتاری ئەم دواییانەی سکرتێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان نەبوایە، لە مێژبوو لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی (یەکێتیدا) شەڕێکی خوێناوی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی دیدا بەرپا دەبوو. لە مێژبوو چەندان نووسەر وندەکران و هەڕەشەیان لێدەکرا، بەڵام دەزانیت ئەمە لەبری ئەوەی

حاڵەتێکی باش بێت، دەلالەت لە دۆخێکی تا سەر ئێسقان نێگەتیڤ دەکات. دەلالەت لەوە دەکات ئازادیی نووسین و ڕەخنەکردن و ململانێی سیاسی، تەنها بەستراوە بە مانەوەی کەسێکی دیاریکراوەوە، نەك بە کۆمەڵێ مافی سروشتی خۆمانەوە کە کەس نەتوانێت پێشێلی بکات. هەر ئەوەی کە هەموومان دڵنیایین لەوەی ئەم هێزانە ویستیان بێدەنگ یان زیندانیمان بکەن لەسەر ئەو قسەو ڕایانەی کردوومانە (جا با بە فیعلی بیکەن، یان نەیکەن)، دەلالەت لە ژینگەیەکی تا سەرئێسقان داخراو و تۆتالیتار دەکات کە بێگومان لەگەڵ دەوڵەتی عەلمانیدا یەك ناگرێتەوە.

عەلمانییەت ئەو کاتە دەست پێدەکات کە سنوورەکانی کارکردنی دەوڵەت دەستنیشانکرابێت و مافەکانی هاوڵاتیش دیاریکراو بێت، نەك ئەو مافانە لەژێر ڕەحمی دڵفراونی کەسانێکدا بێت کە خوداش نازانێت کەی و چۆن دڵفراوانییەکەیان تەواو دەبێت. مەسەلەکە ئەوە نییە هێزەکانی ئێمە کوڕی باشن و سەرکوت و بێدەنگمان ناکەن، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە لە بنەڕەتدا ئەو توانا و دەسەڵاتەیان نەبێت کە کەی ویستیان سەرکوتمان بکەن. مەسەلە ئەوەیە بەپێی یاساگەلێکی دیاریکراو دادگایەکی شەرعی نەبێت، نەتوانن پەنجەمان بۆ بەرن. مەسەلە ئەوەیە ئێمەش ئەو دەزگا و ڕێکخراوە سەربەخۆ و بەهێزانەمان لەبەردەستدا بێت کە وەك قەڵغانێك، لە دەستدرێژییەکانی ئەوان بمانپارێزێت. بێگومان هەموو ئەم شتانەش لەم وڵاتەی ئێمەدا نادۆزرێتەوە، هەر لەبەر وەش قسەکردن لە عەلمانییەتی هێزە کوردییەکان بە نوکتە دەزانم!

**شوان ئەحمەد: بۆچی تەواوی هێزە ئیسلامییەکان بە ئیسلامییەکانی کوردستانیشەوە ئەوەندە بەچاوی بەدگومانییەوە دەڕواننە عەلمانییەت، لە کاتێکدا ئەوان گەر ڕووکەشانەش بێت تەواوی مەسەلەکانی دیکەی وەك: (دیموکراسییەت، کۆمەڵگەی مەدەنی، پلۆرالیزم، ژیانی حیزبایەتی)یان قبوڵە، بەڵام نەفرەت لە عەلمانییەت دەکەن و بە پلانێکی خۆرئاوایی دەزانن؟**

**ڕێبین هەردی:** وەڵامی ئەم پرسیارە ئاشکرایە، چونکە عەلمانییەت لەبری ئەوەی دەلالەت لە فۆڕمی دەوڵەتی دیموکراسی بکات لە وڵاتەکانی ئێمە و دەوروبەریشماندا، وەك ئایدیۆلۆژیایەکی دۆگمایی هات کە بۆ سەندنەوەی کۆمەڵێ مافی دیاریکراو لە هەندێك کەسی دیاریکراو بەکارهێنرا. عەلمانییەت بوو بە ئایدیۆلۆژیایەك کە بێدەنگ و سەرکوتی ئەو هێزە سیاسییانە دەکات کە مەرجەعیان دەبەنەوە سەر دین، بەڵام بەڕاستی ئەگەر ئەو هێزانە دیموکراسییەت و کۆمەڵگەی مەدەنی و پلۆرالیزمیان قبوڵ بێت، ئەوا بێگومان لە ئەرزی واقیعیشدا واتە عەلمانییەتیان قبوڵە، چونکە وەك پێشتر وتم عەلمانییەت دەربڕینێکی دی دیموکراسییە لە فۆڕمی دەوڵەتدا. ئەوەی گەمەکانی دیموکراسی قبوڵ دەکات، واتە ئەوەش قبوڵ دەکات کە لابردنی لەسەر دەسەڵات لابردنی خودا و فەرمودەکانی نییە، بەڵکو لابردنی مرۆڤگەلێکە کە نوێنەری خۆیان و قەناعەتەکانیانن، نەك نوێنەری خودا و فەرمودەکانی. عەلمانییەتیش لە ناوەڕۆکدا بریتییە لەو دەوڵەتەی خۆی بە نوێنەری خودا نازانێت و لابردنی خۆی بە لابردنی ڕێبازی خودا لە قەڵەم نادات و بە یەك

وشە شەرعییەتی خۆی لە ئاسمانەوە ناهێنێت. مادام ئەم هێزانە قبوڵی دیموکراسی و فرەیی دەکەن، واتە ئەوەیان قبوڵە شەرعییەتیان لە خەڵك و بیروڕای خەڵکییەوە دێت، نەك ئاسمان و کتێبە پیرۆزەکانەوە، ئەمەش بەیەك وشە مانای قبوڵکردنی عەلمانییەتە، بەڵام ئایا بەڕاستی ئیسلامییەکانی ئێمە بڕوایان بەفرەیی و کۆمەڵگەی مەدەنی و دیموکراسی هەیە؟ ئایا بەڕاستی کار بۆ چاندنی دیموکراسی و فرەیی دەکەن؟ من گومان دەکەم ئەمە وابێت.

ئیسلامییەکانی ئێمە هێندەی عەلمانییەکانمان، لە جیهانی دیموکراسی و فرەییەوە دوورن. تۆ تەماشاکە ئیسلامییەکان چۆن پێشوازی ئەو گۆڕانە بچووکەی یاساکانی ئەحواڵ شەخسیان کرد. تەماشاکە چ نەریتێکی داخراو بەرامبەر بە ژن پەیڕەو دەکەن و چۆن لە شەفافییەت دەترسن. گوێ لە خوتبەی هەندێك مەلایان بگرە، بزانە بە چ زمانێکی پڕ هەڕەشە و خۆبەڕاستزان قسە دەکەن. گوێ لە هەڕەشەی هەندێك خوتبەی هەینیان بگرە کە نیوەی هەڕەشەیە، لەم نووسەر و ئەو سیاسی. پێموایە بڕوا بوون بە دیموکراسی و فرەیی تەنها بە وتن نییە، چونکە لەمێژە ئێمە خاوەنی ئەو هێزە سیاسییانەین کە دەڵێن بڕوامان بە دیموکراسی هەیە. بڕوابوون بە دیموکراسی دەبێت لە ڕەفتار و کردارەکانیاندا ڕەنگ بداتەوە... لە واقیعی عەمەلیدا بیبینین و هەستی پێ بکەین. ڕووداوەکانی لەمەڕ خۆمان دەڵێن پێشێلکردنی ئازادی لە کوردستاندا ڕوو دەدات، بەڵام ئیسلامییەکان ڕستەیەکی لەسەر ناڵێن. کۆمەڵێ مەلای تاریك لەم مزگەوت و ئەو مزگەوتەوە، پەلاماری فلان و فیسار ڕۆشنبیر لەسەر

نووسینی شیعر یان چیرۆك یـان لێكۆڵینەوەیـەك دەدەن و ئیسـلامییەكان ڕستەیەكی لەسەر ناڵێن. سەدان ژن لەم وڵاتەدا بەناوی نـاموس و دینـەوە دەكوژرێن و ئیسلامییەكان، هەڵوێستێكی دیاری لە بەرامبەردا وەرناگرن. چەندان نووسەر لە كوردستاندا بەناوی ئیسلامییەكانەوە كوژران، كەچـی هـیچ گرووپێكـی دیـنی ئیدانـەی ئـەو كوشـتنانەی نـەكرد و تەنانـەت ئەوەشیان بەدرۆخستووەتەوە كە ئەوان نەبوون.

لە كاتی لێدانی كۆمۆنیستەكاندا ئیسلامییەكان نـەك هەڵوێسـتیان وەرنەگرت، بـەڵكو دەگوترێـت باڵێكیـان داوای كـردووە ئـەو شـەڕە بـەو بسپێرن... هەموو ئەم شتانە وامان لێدەكات گومان لەوە بكەین بەڕاستی ئەوانە بڕوایان بە دیموكراسـی و كۆمـەڵگـەی مـەدەنی و فرەیـی هـەبێت، چونكە ئەم شتانە دیكۆرێك نین و بەرزی بكەینەوە، بەڵكو كۆمەڵێ تێزی دیاریكراون كە ئەركی عەمەلی و ڕەفتاری واقیعیمان بەسەردا دەسەپێنن. تەنها ئەو كەسە بڕوای بەفرەیی هەیە كە بەرگری لە نەیارەكەی خۆشی لە ساتەوەختی سەركوتكردندا دەكات، نەك ئەو كەسـەی ناچـارە و ناتوانێـت قبوڵی هێزی جیاواز نەكات. پێموایە دیموكراسـیخوازی ئیسـلامییەكان و عەلمانییەكانیش لەژێر پرسیاری گەورەدایە.

**شـوان ئەحمـەد: بـەبڕوای مـن ترسـی عەلمانییـەكان لـە بزاوتـە ئیسلامییەكان، ترسێكی واقیعییە و لەجێی خۆیدایە. نەك تەنها لەبـەر ئـەوەی ئەمانـە ئـایین تێكـەڵ بـە سیاسـەت دەكـەن، بـەڵكو هاوكـات لەبەرئـەوەی ئیسـلامی ئـەمڕۆ ئیسـلامێكی دەستەوسـتانە بەرامبـەر**

**کێشەکانی دنیا و بەدەست قەیرانی قوڵەوە دەناڵێنێت و ناتوانێت بەشێوەیەکی ئەقڵانی تەعبیر لەخۆی بکات. لەم بارەیەوە چی دەڵێیت؟**

**ڕێبین هەردی:** بەڵام ئایا ڕاستە ئەو هێزەی بە بڕوای من و تۆ چارەسەری کێشەکانی سەردەمی پێ نەبێت، لە مافە سروشتییەکانی خۆی بێبەش بکرێت. ئایا ڕاستە هەرکەس دەستەوەستان بوو بەرامبەر بە دنیای تازە و قەیرانی قوڵی هەبوو (بێگومان بەبڕوای من و تۆ) هەقی سیاسەتکردنی نەبێت. من پێموایە جگە لە ئیسلامییەکانیش زۆربەی هێزە عەلمانییەکان، چارەسەرێکیان بۆ کێشەکانی ئەمڕۆ کوردستان پێ نییە و لەبەردەمیا دەستەوەستانن... بەڵام هەرگیز نابێت ئەمە بە مانای ئەوەبێت، ئەم هێزانە هەقی سیاسەتکردنیان نییە. ئەگەر ئێمە مافی سیاسەتکردن و نەکردن کورت بکەینەوە بۆ ئەو هێزانەی کە بە بڕوای من و تۆ چارەسەریان پێ نییە، ئایا خەریکی دووبارەکردنەوەی ئەزموونی تۆتالیتارییەت نین؟ پێموایە دەبێت لە سەرەتاوە لەسەر ئەوە ڕێك بکەوین هەموو کەسێك مافی سیاسەتکردنی هەیە، جا عەقیدەی هەرچییەك دەبێت با ببێت. ئەگەر عەقیدەکەشی بە بڕوای من و تۆ هەڵەبوو، دەبێت وەڵام بدرێتەوە و وتووێژی لەگەڵدا بکرێت، نەك مافی سیاسەتکردنی لێبسەنرێتەوە. جیاوازی عەقیدە و بیروڕاکان لەبری ئەوەی بەرەو سەرسەختی یەکێکمان دژی یەکێك ببات، دەبێت بەرەو قسەی زیاتر و وتووێژی زیاتر و کرانەوەی زیاترمان ببات. ئەو هێزانەی بە بڕوای من و تۆ وەڵامی کێشەکانی ئەم سەردەمەیان پێ نییە، دەبێت ڕەخنەکرێن نەك لە مافە سروشتییەکانی خۆیان بێبەش بکرێن.

سەبارەت بە ترسی عەلمانییەکانیش کە واقیعە و لەجێی خۆیدایە، بەڕاست نازانم مەبەست چ مەترسییەکە، بەڵام دەزانم ئەو مەترسییەی هێزە بەناو عەلمانییەکان لە داهاتوودا دروستیانکردووە، زۆر لەو مەترسییە گریمانکراوەیە واقیعیترە کە گوایا ئیسلامییەکان لە داهاتوودا دروستی دەکەن. ئەگەر مەترسی عەلمانییەکان لە ئەگەر و ئەشێ و ناشێدایە، ئەوا مەترسی عەلمانییەکان شتێکی فیعلییە و هەر ئێستا لە کوردستاندا ڕوو دەدات... لە هەموو ئەو مەترسییانە ترسناکتریش شەڕی ناوخۆیە کە کۆی ئەزموونەکەی خستووەتە ژێر هەڕەشەی لاوازبوون و لەناوچوون. چ مەنتیقێکی عەقلانی و بابەتی وامان لێدەکات، شەڕ لەگەڵ مەترسییەکدا بکەین کە لە ئەگەر و نەگەردایە و فەرامۆشی هەموو ئەو مەترسییە فیعلیانە بکەین کە ڕاستەوخۆ و هەر ئێستا لەناو هێزە عەلمانییەکانەوە پیادە دەکرێت. چ لۆژیکی تیایە لە ئێستاوە بەناوی مەترسییەکی غەیبییەوە کە فیعلی نییە و دڵنیاین لەوەی ڕوودەدات یان نا، سەرقاڵی شەڕکردن بین لەگەڵ کەسانێکدا وەك ئێمە بیر ناکەنەوە و شەڕ لەگەڵ هیچ لەو مەترسییە فیعلیانە نەکەین کە لەلایەن هێزە عەلمانییەکانەوە هەر ئێستا پیادە دەکرێت؟

بێگومان مەبەستی من ئەوە نییە کە ئیسلامییەکان هیچ کێشەیەکیان نییە و هەڵگری هیچ مەترسییەکیش نین (پڕ ئاشکرایە من خۆم بە عەلمانی دەزانم و خۆم بە ئیسلامی دانانێم)، بەڵکو مەبەستی من ئەوەیە با ململانێکردن و شەڕکردن لەگەڵ مەترسییە فیعلییەکاندا دوانەخەین بۆ شەڕکردن لەگەڵ مەترسییەکی داهاتوویدا. با ئەوەمان

لەیاد بێت کە ڕەنگە قسەکردن لە مەترسی ئیسلامییەکان بۆ شاردنەوەی کۆمەڵێ مەترسی دی بێت کە لەلایەن هێزو گرووپی دیەوە پیادە دەکرێت. دواجار بڕوای تەواویشم هەیە کە گەر ئیسلامییەکان بەڕاستی مەترسیدارین، ڕێگەی خونساکردنەوەی ئەو مەترسییە بە کوشتن و شەڕکردن لەگەڵیاندا ناڕوات، بەڵکو بە چاککردن و دیموکراتیزەکردنی زیاتری هێزە بەناو عەلمانییەکاندا دەڕوات. با منیش وەك ئەوانەی قسە لە مەترسی ئیسلامییەکان دەکەن (کە لێت ناشارمەوە من زۆر بەو خەستییە بڕوام پێی نییە)، بڵێم بەڵێ ڕاستە و ئیسلامییەکان ئێجگار مەترسیدارن بۆ کوردستان. داخۆ چۆن ئەم مەترسییە ناهێڵن: بە سەرکوتکردن و ڕێگەگرتن و کوشتنیان، یان بە چاککردنی کۆی ئەو خەوشانەی لە هێزە عەلمانییەکاندا هەیە؟ ئایا بە دیموکراتیزەکردنی زیاتری عەلمانییەکان و کرانەوەی زیاتر و دادپەروەری زیاتر، ناتوانین ڕێگە لەو مەترسییانە بگرین؟

من پێم وایە جگە لەم ڕێگایە هیچ ڕێگایەك بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەو مەترسییانەدا نییە کە لەلایەن ئەم هێزە یان ئەو هێزەوە ڕەنگە بێنە دی، چونکە دڵنیام جگە لەم ڕێگایە هەموو ڕێگاکانی دی بۆ لەناوبردنی ئەو مەترسییانە نییە کە ڕووبەڕووی کوردستان بووەتەوە، بەڵکو بۆ سەقامگیری دەسەڵاتی هێزێکی سیاسی دیاریکراوە کە خەوشەکانی خۆی لە شەڕی دەرەکیدا دەشارێتەوە. گەر بەڕاستی دەمانەوێت کوردستان لەو مەترسییانە دوور بخەینەوە کە ڕووبەڕووی بووەتەوە، دەبێت بەر لە

ئیسلامییەکان شەڕ لەگەڵ ئەو مەترسییانەدا بکەین کە هێزە عەلمانییەکان بەرەو ڕووی کوردستانیان کردووەتەوە.

**شوان ئەحمەد: پێت وانییە لە هەر ژینگەیەکی ئیسلامیدا باسمان لە عەلمانییەت کرد، پێویستمان بەوە دەبێت کە مەسەلەی خەلافەت بێنینە پێشێ؟**

**ڕێبین هەردی:** پێموانییە ئیسلامی ئێستا داوای گەڕانەوەی خەلافەت بکات. ئیسلامی سیاسی ئێستا پاشماوەکانی خەلافەتی عوسمانی و خەلافەتی عەباسی نین کە دەیانەوێت ئەو ڕۆژگارانە بگەڕێننەوە. ئیسلامی سیاسی دیاردەیەکی ئەمڕۆییە و نەوەی سەردەمی ئینتەرنێت و شۆڕشی سیبرنیتیکە. پێموانییە لەم سەردەمە تازەیەدا، مەسەلەی خەلافەت جارێکی دی زیندووببێتەوە. جیهانی ئێستا زۆر ئالۆز و هەمەڕەنگترە لەو سەردەمەی، بتوانێت بەئاسانی خەڵکانێکی زۆر لەسەر هەمان ڕێباز و بیروبۆچوون کۆبکەیتەوە. هەر لەناو ئیسلامییەکان خۆشیاندا دنیایەك جیاوازی بیروبۆچوون هەیە کە کۆکردنەوەیان لەژێر چەترێکدا ئاسان نییە. بەکورتی پێم وایە باسکردنی خەلافەت تەنها نرخێکی مێژوویی هەیەو هیچ ئەگەرێك بۆ زیندووبوونەوەی لەمڕۆدا لەئارادا نییە.

**شوان ئەحمەد: لەناو ژینگەی ئێمەدا ئەگەری پێکەوەژیانێکی ئاسایی لەنێوان هێزە عەلمانییەکان و ئیسلامییەکاندا هەیە، پێکەوە ژیانێك کە لە مەترسی بەریەککەوتن و تەقینەوە بەدووربێت؟**

**ڕێبین هەردی:** بەڵێ، چۆن ناکرێت. ئێمە هەر ئێستا بەیەکەوە دەژین. ئیسلامییەکان لە هەردوو حکومەتی هەرێمدا بەشدارن و لە هەموو هەڵبژاردنێکیشدا بەشداری دەکەن و بەپێی خۆشیان دەنگ دەهێنن. ئێستا پێکەوەژیانی سیاسی هەیە. ئەوەی ئێستا پێویستە بکرێت ئەوەیە ئەم پێکەوەژیانە سیاسییە، بکرێت بە پێکەوەژیانێکی ڕاستەقینەی فیکریش. مەبەستم لە پێکەوەژیانی فیکری، وتووێژێکی کراوەیە کە دوورە لە دروستکردنی تۆمەتی ناڕەوا و نادروست بۆ یەکدی. مەبەستم لەو جۆرە وتووێژەیە کە لەو حوکمە بێویژدانانەوە دەست پێ ناکات کە ئیسلامییەکان عەمیلن و لەودیو سنوورەکانەوە هاتوون... کۆمەڵێ ڕیش درێژی دڵڕەشن کە تەنها بیر لە سەربڕینمان دەکەنەوە، بەڵکو لە تێزە فیکرییەکان و ئەو پرۆژەیە قسە دەکات کە ئیسلامییەکان بۆ بەڕێوەبردنی وڵات پێشکەشی دەکەن.

مەبەستم لە پێکەوەژیانی فیکری هەرگیز نەمانی جیاوازی و ململانێی فیکری لەگەڵ یەکدیدا نییە، بەڵکو مەبەستم بوونی بەردەوامی ئەو ململانێیەیە، بەڵام لە فۆرمێکی دوور لە سڕینەوە و ئیلغاکردن. مەبەستم لە جیاوازی فیکری ئەوجۆرە جیاوازییەیە کە وەك شەڕی یەکەمی بزووتنەوە نامانگەیەنێتە ئەو ئاستە تراژیدییەی بە کوشتنیان بڵێین ئۆخەی، بەڵکو ئەو جیاوازییەیە کە هانمان دەدات ئاسۆی

کراوەتر و دادپەروەرتر بپشکنین و هەردووکمان ناچار دەکات، پشت بە بەڵگە و بەڵگاندنی زیاتر ببەستین. ئەو دەمەی بەڵگاندنیش دەست پێدەکات، جیاوازییەکانیشمان چەند گەورەبن، لە مرۆڤبوونماندا وەك کائینێکی عاقڵ و بیرکەرەوە بەیەکمان دەگەیەنن. واتە پێویستمان بە پێکەوەژیانێکی ئەو جیاوازییانە هەیە کە هەرگیز هەستی هاودەردی و ڕێزگرتن لە حورمەتی ژیانی یەکدی لەدەست نادات.

پێموایە پرۆژەیەکی لەو چەشنەش چەند پێویستی بەدادپەروەری و کرانەوەی هێزە سیاسییەکان بەرامبەر بەیەك هەیە، سەد هێندەش پێویستی بە قەڵەمی ئەو ڕۆشنبیرانە هەیە کە لە هەوڵی هێنانە ئارای زمانێکی تازەدا بن بۆ قسەکردن لەسەر یەکدی. پێویستمان بەوە هەیە واز لەو گەمە ناشیرینە بێنین کە وێنەیەکی ناپاك لە ئیسلامییەکان دەکێشێت و جیهانی عەلمانییەکانیش وەك مەلهایەکی گەورە دەبینێت. پێویستمان بەوە هەیە لەو ڕاستییە بگەین کە چ ئیسلامی و چ عەلمانییەکان، خەڵکی ئەم وڵاتەی خۆمانن و لەپێناوی ئەو وڵاتەشدا ماندوویی دەچێژن و لەبەر ئەوەش کە هەر هەموویان مرۆڤن و هاوڵاتی خۆمانن، شایستەی ئەوەن هەبن و بژین و نەکوژرێن. دەبێت بۆ جیهانێك بگەڕێین، چیدی کەس تیایدا بەکوشتنی ئەویدی نەڵێت: "ئۆخەی"!

# ئیسلامی سیاسی و دیموکراسی

د. سەباح بەرزنجی

**شـــوان ئەحمـــەد:** بزاوتـــە ئیســـلامییەکان چـــۆن دەڕواننـــە پرۆســـەی دیموکراسییەت، ئایا بەڕاستی ئەو بزاوتانـــە بڕوایـــان بـــە دیموکراســـییەت هەیە، یاخود بەتەنها قەناعـــەتێکی ڕوکەشـــە و پردێکـــە بـــۆ گەیشـــتنە دەسەڵات؟

**د. ســـەباح بـــەرزنجی:** لـــەناو بزاوتـــە ئیســـلامییەکاندا ڕاو هەڵوێســـتی جیاواز لەسەر دیموکراسی هەیە. هەیانـــە دیموکراســـی بـــە شـــیرك و بـــەبێ باوەڕی لە قەڵەم دەدەن، هەشیانە بە شێوازێکی گونجـاو بـــۆ گواســـتنەوە و چاودێریکردنی دەسەڵاتی دەزانن. هەندێك بەزادەی هەلومەرجی خۆرئـــاوا و بەکارهاتووی ئەوێی دەزانن و پێـــانوایە، دیموکراسی خۆرئاوا هیچ پـــەیام و قازانجێکی بۆ گـــەلانی موســـڵمان و خۆرهـــەڵات پـــێ نییـــە، جگـــە لـــەوەی

بیانکاته پاشکۆیەك بۆ لیبرالیزم و سەرمایەداری غەربی لە سیاسەت و ئابووری و فەرهەنگدا، چونکە پرسەکە پرسێکی ئالۆز و ورد و فرەجەمسەرە، بۆیە ناتوانین بە ڕەهایی و بە سەرپێی بڵێین بزاوتە ئیسلامییەکان بڕوایان بە دیموکراسی هەیە یان نییە، یاخود وەکو ئامرازێکی گەیشتن بە دەسەڵات بەکاری دەهێنن.

لەلایەکەوە، زۆر سروشتییە کەسێك کە ئیسلام بە بەرنامەی ژیان و سەرچاوەی بیرکردنەوە و هەڵوێستی خۆی دەزانێت، دیموکراسی بەتەنها ئسلوبێکی فەرمانڕەوایی نەك تاقانە ئسلوب بزانێت و مافی خۆشیەتی لە کەشوهەوایەکی دیموکراسیدا، سوود لەو ئازادییە نیسبییە وەربگرێت کە بۆی دەڕەخسێت، چونکە وەك بیروبڕوا هەموو کەسێك ئازادە لە هەڵبژاردندیدا و وەکو مومارەسەش ئازادە چ ئسلوبێك پەیڕەو دەکات لە سیاسەتدا.

بۆیە نابێت ئەو ڕەخنەیە لە بزاوتە ئیسلامییەکان بگیرێت کە بۆچی بڕوایان بە دیموکراسییەت نییە، یان بۆچی وەکو پردێکی گەیشتنە دەسەڵات مامەڵەی لەگەڵ دەکەن... خودی دیموکراسییەتیش ئەوە داخوازی دەکات کە پردێك بێت بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی و لە هەموو دنیاشدا هەر بەهەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵ کراوە. خەڵك بۆ بەڕێوەبردنی ژیان و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان دیموکراسییەتیان قەبووڵە، ئەگینا هەرکات بزانن ئەو ڕۆڵە نابینێت دەستبەرداری دەبن و هەوڵی ئەڵتەرناتیڤێك دەدەن بۆی. بۆیە زۆر هەڵەیە وابزانین کە مێژوو کۆتایی پێهاتووە و دیموکراسی قەدەری کۆتایی مرۆڤایەتییە. تاکو ئێستا

دەتوانین هەر ئەوەندە بڵێین کە دیموکراسییەت تا ئەمڕۆ گونجاوترین بیردۆزە و فەلسەفەی دەستکردی مرۆڤە، بۆ گواستنەوەی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی!

**شوان ئەحمەد: بزاوتە ئیسلامییەکان دوا ئامانجیان چییە، چەسپاندنی حوکمی ئیسلامییە، یاخود دیموکراسییەتە؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** بزاوتە ئیسلامییەکان هەر ئەوەندەیان لەو خەڵکە موسڵمانە دەوێت، وەکو لە ژیانی تاك و خێزاندا پێویستە ملکەچی یاساو ڕێساکانی شەریعەت بن، لە تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیشدا هەمان شێوە پەیڕەوی لە شەریعەت بکەن... بۆ ئەوەی لە دنیاو لە ئاخیرەتیشدا ئاسوودە و بەختەوەر و سەربەرز بن. کەواتە ئامانجی ئەمانیش ئەوەیە خەڵکی خوا بەپێی بیروبڕواکەیان بژین، هەم ناوەوەیان ئیسلامی بێت و هەم دەرەوەیان. واتە بە ناوەڕۆك و بەڕواڵەت لەژێر حوکمی ئیسلامیدا بن.

**شوان ئەحمەد: پرسیارێکی زۆر دەکرێت لەمەڕ ئەوەی ئایا ئیسلامی سیاسی لە جەوهەردا هەڵگری پرۆژەیەکی فاشییە یان دیموکراسی... بەڕای من ئیسلامی سیاسی زیاتر هەڵگری پرۆژەیەکی فاشییانەیە، لەبەر ئەوەی دەیەوێت یەك تەفسیر بداتە دنیا و ئیشکردنی ئیسلامی سیاسی، تەواو بۆ خۆی هەوڵێکە بۆ کوشتنی هەموو دەنگەکان لەپێناوی تاك دەنگیدا. سەبارەت بەم مەسەلەیە ئێوە چ ڕایەکتان هەیە؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** بەداخەوە ئەم تێگەیشتنەی جەنابت پێی دەگوترێت (قصاص قبل الجناية)و لە تەسەورێکی بەپەلە و دوور لە سەرنج و قوولبوونەوە و بەپێی وێناکردنی ئاژانسەکانی دژ بە ئیسلام دروست بووە.

یەکەم: چۆنت زانی پرۆژەی ئیسلامی سیاسی پرۆژەیەکی فاشییانەیە. ئەگەر مەبەستت ئیسلامییەکانی کوردستانە، کامیان گووتویانە: ئێمە دەمانەوێت هەموو دەنگەکان بکوژین و هەموو بۆچوونەکان موسادەرە بکەین؟ یەکبوون یان یەکگرتوو؟ ئەوەندەی من بزانم هیچ کام لەو دوو حیزبە سەرەکییە ئیسلامییەی کوردستان، خۆی ئەوەندە بە گەورە و قەبە نازانێت کە هەموو خەڵك لەخۆیدا جێ بکاتەوە. تا پێشیان کرابێت لەگەڵ حیزبە دەسەڵاتدارەکانی یەکێتی و پارتی خیاری موشارەکەیان هەڵبژاردووە، نەك موتارەکە.

دووەم: خودی ئیسلامی سیاسی بریتییە لە کۆمەڵە دەنگێکی جیاواز و کۆمەڵە دیدگایەکی جیاواز، لەسەر تێکڕای موفرەدات و چەمکەکانی ئەمڕۆ.

سێیەم: قورئانی پیرۆز و شەریعەتی ئیسلام لە ڕووی دەقە پیرۆزەکانەوە، بانگەوازی پلۆرالیزم دەکەن لە هەموو ئاستەکاندا. پلۆرالیزمی ئاینی و ئینسانی و قەومی و تەنانەت دروستبوونی گرووپە کەلامی و فیقهیە جیاجیاکان، بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئیسلام خۆی قبوڵی فرەدەنگی و فرەلایەنی کردووە.

چوارەم: کە لە بازنەی کوردستانیش دەچینە دەرەوە، ئیسلامی سیاسی تەنیا لە دووسێ شوێن دەسەڵاتی بەدەستەوەیە، کە لە هەندێکیاندا

لەوانەیە دەنگ و ڕەنگەکانی تری کوشتبێت وەکو باسی (ئەفغانستان) دەکرێت، بەڵام لە هەندێکی تردا وەکو ئێران، دەبینین پلۆرالیزمێکی بەنیسبەت باش ئامادەبووە و چاوەڕوانی زیاتریشی لێدەکرێت.

پێنجەم: تەنانەت ئەزموونی ئەفغانستانیش، تا کاتی گەیشتن بە دەسەڵات و ماوەیەکیش دوای ئەوە، ئەزموونێکی فرەجەمسەر بوو، بەڵام چونکە ئاستی هۆشیاری خەڵکەکە بەرگەی ئەو فرەچەشنییەی نەدەگرت، ئەو کارەساتەی لێدروست بوو کە هەموومان کەم و زۆر لێئاگادارین. کەواتە مەرج نییە دیموکراسییەت بۆ هەموو کۆمەڵگایەکی ئەم سەرزەوییە دەست بدات. نەك بەو مانایەی پاساو بۆ دیکتاتۆرییەت بهێنینەوە، بەڵکو بەو مانایەی دیموکراسییەت شتێك نییە دروست بکرێت، بەڵکو بەو مانایەی دیموکراسییەت قۆناغێکە کە کۆمەڵ دوای چەندین قۆناغ پێی دەگات!

**شوان ئەحمەد: دیموکراسییەت لە ناوەڕۆکیدا پرۆسەیەکە بەردەوام لەنێوان بوونی دژەکاندا کار دەکات، ئیسلامی سیاسیش هەوڵێکە بۆ بنەبڕکردنی هەموو ململانێیەك و ڕەنگڕێژکردنی دنیا بە یەك ڕەنگ. لێرەوە چۆن دەکرێت قسە لەسەر پێکەوە هەڵکردنی ئیسلامی سیاسی و دیموکراسییەت بکەین؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** ڕەنگە ئەو قسەیەی ئێوە سەبارەت بە هەندێك بزاوتی ئیسلامی و هەندێك بزاوتی نائیسلامی دروست بێت، بەڵام مەرج نییە بتوانین هەمیشە و بۆ هەموو بزاوتێك تەعمیمی بکەین. گرنگ

ئەوەیە ئەو بزاوتە ئیسلامییە چۆن و لەکوێ و ئەو دیموکراسییەتەش تەرجەمە بکرێت لەسەر واقیع.

**شوان ئەحمەد: بۆچی لای تەواوی بزاوتە ئیسلامییەکان، دیموکراسییەت پێناسەیەکی دیار و تەواوی نییە و هەمیشە کەوتووەتە پەراوێزی گوتار و پەیامەکانیانەوە؟**

**سەباح بەرزنجی:** چونکە لای هەڵگرانی دیموکراسییەتیش، یەك پێناسەی تەواوی نییە و هەرکەس لە گۆشەنیگای خۆیەوە لێکی دەداتەوە! خودی مەقوولەی دیموکراسی بەو شێوەیە لەدایك بووە کە قۆناغ بەقۆناغ چەمکی تازەی لێی وەربگرێت. بۆیە هەر کەسێکیش ئەو مافەی هەیە بەپێی هەلومەرج و بەرژەوەندییەکانی خۆی پێناسەی بکات. هەر بۆیە لە دنیای ئەمڕۆدا وەکو دیموکراسییەتی غەربیمان هەیە، دیموکراسییەتی ژاپۆن و ئێران و هیندستانیشمان هەیە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەم مۆدێلانە لە هیچ شتێکدا یەك ناگرنەوە، یان لە هەموو شتێکدا وەکو یەکن. ڕەنگە ڕازی مەسەلەکەش لەوەدابێت کە دیموکراسییەت وەکو دەسەڵاتی گەل یان فەرمانڕەوایی گەل، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك دەگۆڕێت و لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر ڕەفتاری جیاواز و ئەرکی جیاوازی دەبێت.

**شوان ئەحمەد: تۆ تا چەند لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا تەبایت کە دەڵێت دیموکراسییەت و سەرمایەداری، دوو خەسڵەتی تایبەتی ژیاری خۆرئاوان و ناگوێزرێنەوە ناو هیچ ژینگەیەکی دی؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** یەکێك لە سەرەتاییترین بنەماکانی دیموکراسی ئەوەیە، هەر کۆمەڵگایەك ئازادبێت لە هەڵبژاردنی جۆری ژیان و جۆری دەسەڵاتدا. ئەم هەڵبژاردنەش کارێکی سادە و ئاسان نییە، چونکە کۆمەڵگا لە ڕەوتی مێژووییدا دوای تێپەڕاندنی زۆر هەلومەرج و زاڵبوون بەسەر چەندین کۆسپ و تەگەرەدا، دەگاتە ئەو ئاستە هۆشیارییەی سیستمێك لە سیستمەکانی حوکم هەڵبژێرێت و پەیڕەوی بکات.

پێموانییە دیموکراسییەت و سەرمایەداری دوو خەسڵەتی تایبەتی ژیاری خۆرئاوا بن، هەرچەندە ڕەنگە لە خۆرئاوا زیاتر بەرجەستەیان کردبێت و ڕەنگە ئەو تەفسیراتەی ئەمڕۆ دەکرێت بۆ ئەو دوو چەمکە وامان پێ ئیلقا بکەن کە ئەو دووکاڵایە تەنها بە باڵای ئەو ژیارەن، بەڵام چونکە چەمکە تەجریدییەکان قابیلی پیادەکردنن لە هەموو هەلومەرجێکی ژیاریدا، هیچ مانیعێك نابینم لە گواستنەوەیان بۆ هەر ژینگەیەکی تر، بەو مەرجەی گوێزەرەوەکە بزانێت چۆن و کەی و چی دەگوێزێتەوە! جگە لەوەی هیچ سنوورێك لەنێوان هەرێمە فیکرییەکاندا، بە سنووری ئەبەدی و هەتاهەتایی نازانم. مەگەر نابینی "فارابی" لە شارە جوانەکەیدا کاریگەری کۆماری "ئەفلاتوون"ی بەسەرەوە دیارە، یاخود ژیاری ئەمڕۆی خۆرئاوا جێگە دەست و پەنجەی "ئیبن ڕوشد"ی پێوەیە!

**شوان ئەحمەد: هۆکارەکانی نەبوونی دیموکراسییەت لە خۆرهەڵات و بوونی لە خۆرئاوادا دەگەڕێنیتەوە بۆ چی، ئایا هۆکاری ئایینی لەم جیاوازییەدا ڕۆڵی هەیە؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** دیموکراسییەت لە خۆرئاوا مێژوویەکی دووردرێژی هەیە، خۆرئاواش دوای ئەزموونی جۆراوجۆر گەیشتووە بەم شێوازە و بەم (میتۆد و مۆدێلە...). قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵی هاتوون و هەر قۆناغەی بەجۆرێك گۆڕانکارییان بەسەردا هێناوە، تا گەیشتووە بەمڕۆ کە دەوڵەت و دەسەڵات بەهەموو شێوەیەك لەخزمەت هاوڵاتیدایە. ڕەنگە بوونی دیموکراسییەت لەوێ و نەبوونی لێرە لەباتی هۆکارێك چەند هۆکارێکی هەبێت، هۆکاری ئایین و شێوەی دەسەڵات و فەرهەنگ و جۆری ئەو مرۆڤەی لەباوەش ئەو ژینگەیەدا گەورە دەبێت.

بێگومان ئایین هۆکارێکی سەرەکییە لەم جیاوازییەدا. نەك تەنها ئایین، بەڵکو جۆری بەکارهێنانی ئاینیش کاریگەری هەیە لەسەر کۆمەڵ. لە جیهانی ئیسلامیدا لادان لە سیستمی شوورا لەو ساتەوەختەوە کە "موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان" هاتە سەر حوکم، کاریگەرترین هۆکاریی داپچڕانی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و گەل بوو. لەولاشەوە لە خۆرئاوا جیاکردنەوەی دین و دنیا (دینی مەسیحی و دنیای ئەورووپی)، بووە هۆی ئەو پێشکەوتن و ڕێنیسانسەی بناغەی بۆ دەسەڵاتی مرۆڤ دانا... کەواتە لە هەردوولا ئایین ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لە ڕەنگرێژکردنی جۆری دەسەڵاتدا، بەڵام هەرکام بەجۆرێك. لێرە لادان لە ئیسلامی ڕاستەقینە و لەوێش لادان لە مەسیحییەتی کڵێسا.

لێره دەسەڵات ئاینی بەکاردەهێنرا بۆ بەهێزکردنی پایەکانی دیکتاتۆری، لەوێش ئایین بەکاردەهێنرا بۆ ئیسلاحی سیاسی و کۆمەڵایەتی. لێره پیرۆزی ئاینیان لەوەدا بینییەوە کە ئاینی سوڵتان و خەلیفە بێت، بەڵام لەوێ پیرۆزی ئاینیان لەوەدا دۆزییەوە کە ئاینی دوور لە سیاسەت و دەوڵەت بێت.

**شوان ئەحمەد: بۆچی تا ئێستاش لە سەردەمی بەجیهانیکردن و شۆڕشی تەکنەلۆژیدا، ئیسلامی سیاسی هەر بە چەمکە سیاسییە کۆنەکانی وەك (عەدل، فەزیلە، شورا) کار دەکات؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** لەبەر ئەوەی ئەو چەمکانە چەمکی نەمر و هەتاهەتایین و تا مرۆڤ مابێت و تا کۆمەڵی مرۆڤایەتی بیر لە دەسەڵات و ژیان بکاتەوە، چەمکەکانی (عەدل، فەزیلە و شورا) هەر دەمێنێت و قەت کۆن نابن... لەبەرئەوەی بەستراون بە جەوهەر و ناخی مرۆڤەوە.

**شوان ئەحمەد: هەرجارێك باسی دیموکراسییەت دێتە پێشێ، ئیسلامییەکان لە بەرامبەردا چەمکی شورا قوت دەکەنەوە. ئایا بەڕاستی شورا مانای دیموکراسییەت دەگەیەنێت؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** بەڵێ، شورا وەکو بنەما و پرانسیپێکی ئیسلامی، دەگونجێت ئەمڕۆ وا ڕاڤە و پراکتیزە بکرێت کە لەگەڵ جۆرێك لە جۆرەکانی دیموکراسییەت یەك بگرێتەوە، وەکو هەندێك لە بیرمەندە موسڵمانەکانیش قەڵەمزەدیان کردووە. بۆ نموونە (عەباس مەحموود

ئەلعەقاد و محەمەد جەلال شەرەف و مالیك ئیبن نەبی)... كە باوەڕیان وابووە لە ئیسلامدا ڕیشەكانی دیموكراسییەت حزووریان هەیە.

**شوان ئەحمەد: هەر سەبارەت بەچەمكی شورا، تۆ پێت وایە ئەو چەمكە ئیسلامی بێت. لەكاتێكدا ئێمە دەزانین كە شورا نەریتێكی خێڵەكانی نیمچە دوورگەی عەرەبە، لەپێش ئیسلامدا و قوڕەیش و هۆزەكانی تر لە (دار الندوة)دا پەیڕەویان كردووە؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** چەمكی شورا وەكو لە كتێبەكانی تەفسیر و فەرموودە و فیقهدا شیكراوەتەوە، جیاوازییەكی بەرچاوی هەیە لەگەڵ ئەو مەفهوومە سەرەتاییەی (دار الندوة) لەپێش ئیسلامدا هەبووە. هەرچەندە بە بەراورد لەگەڵ ئەو سەردەمە و ئەو شێوە ژیانە، ڕەنگە شورای خێڵە عەرەبەكان نموونەیەكی پێشكەوتوو بوو بێت، بەتایبەت ئەگەر بزانین هەموو كەسێك بەپێی ئەو مەعریفەیەی كە هەیەتی ژیانی خۆی بەڕێوە دەبات. (دار الندوة) ڕەنگە بەقیاس لەگەڵ پەرلەمانێكی ئەمڕۆ دواكەوتوو بێتە بەرچاو، بەڵام ئەوە سووكایەتییە بە مرۆڤ كە ئێمە بێین بەپێی ڕواڵەت و ئەژمار ڕاستییەكان بژمێرین، (ئەمە بۆ ئەوەی تۆزێك ئینساف بۆ خێڵە عەرەبەكان بە خەرج بدەین). خۆ ئەگەر شوورا لەو دەستپێكەشەوە هاتبێت، ئەوە هیچ ڕەخنە و پلانێك و هیچ عەیب و عارێك نییە بۆی، چونكە دیموكراسییەتی ئەمڕۆش بەو هەموو لق و پۆپ و دەزگا و ژانرانەوە، لە دەوڵەت شارەكانی یۆنانەوە دەستیان پێكردووە و

ئێستاکەش هیچ بیرمەندێك بە تانە و تەشەرەوە نارِوانێتە دیموکراسییەت، چونکە لەو دەوڵەت شارە یۆنانییانەوە سەرچاوەی گرتووە.

گرنگ ئەوەیە ئیسلام هاتبێت چەمکێکی سەرەتایی و خێڵەکی بەکارهێنابێت و گۆڕانکاری تیاکردبێت و وردەوردە کردبێتی بە دەزگا. هەرچەند ئەم چەمکە گرنگەی شوراش زۆری نەبرد، لەلایەن ئەمەوییەکانەوە زیندەبەچاڵ کرا و بوو بە بەشێك لە مێژوو.

**شوان ئەحمەد: پێت وایە گەر لە ئایندەدا هێزێك لە هێزە ئیسلامییەکانی کوردستان بووە حوکمڕان، بتوانێت دیموکراسییانە ڕەفتار بکات و ئەزموونی ئەفغانستان و سوودان دووبارە نەکاتەوە؟**

**د. سەباح بەرزنجی:** بەندە پێم وایە ئیسلامییەکانی کوردستان وەکو ئەوەی لە دیدگا و بیروبۆچوونیانەوە دەردەکەوێت، خۆیان بە ڕۆڵەی ئەم گەلی کوردستانە و دڵسۆزی ئەم گەلی کوردستانە و دڵسۆزی ئەم خاك و نیشتمانە دەزانن و زۆرجار ڕایدەگەیەنن کە ئەگەر گوڵ نەبن دڕکیش نابن. بۆیە تا پێیان بکرێت ئیجابیانە لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردی مامەڵە و ڕەفتار دەکەن، هەرگیز نایانەوێت ئەزموونی ئەفغانستان و سوودان دووبارە بکەنەوە، چونکە هەرگیز ئەوانەی ئەوێ بە ئایدیاڵ و مامۆستای خۆیان نازانن. تا ئێستاش ئەوەندە ئەزموونیان وەرگرتووە کە ناتوانن بەتەنها حوکمی کۆمەڵگایەکی فرەچەشن و فرەلایەنی وەك کوردستان بکەن.

ئەمە بەشێوەیەکی گشتی ڕای زۆربەی زۆریانە، لە هەمان کاتدا ئینکاری ئەو ڕاستییەش ناکەم کە هەندێ جار لێرە و لەوێ حاڵەتی توندڕەوی لە هەندێك ئیسلامییەوە ڕوودەدات کە پێویستە لەسەر حیزب و دەوڵەت و دامودەزگاکان، لەباتی تەقاندنەوەی بارودۆخ و گەورەکردنی نامەعقول چارەی ڕیشەیی بۆ بدۆزنەوە. وەکو پزیشکێکی خەمخۆر هەوڵی دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی توندڕەوی بدەن کە زیاتر لەو گوتارە ئیستفزازی و شەڕخوازانەی هەندێك بەناو عەلمانییەوە خۆی دەبینێتەوە، کە دەیانەوێت بەزۆر هەموو ئیسلامی بکەنە توندڕەو و بەناوی دیموکراسییەتەوە هەموو مافێکی سیاسی لێ زەوت بکەن.

## "ئیبن خەلدون"
## لەنێوان سۆسیۆلۆژیا و مێژوودا

د. ئەلبێرت عیسا

**شوان ئەحمەد:** ئێوە سالآنێك لە زانکۆکـانی ئـەورووپا و بەشـێوەیەکی ئاکادیمی بە خوێندنی "ئیبن خەلدون"ەوە خەریك بوون، سەرەڕای نووسینی چەند باسێك لەبارەی ئەوەوە بە هەریەك لە زمـانی فەڕەنسـی و ئیتـاڵی. دەکرێت قسەمـان لەو هۆکارانە بۆ بکەیت کە تۆیان بـەلای ئـەم پیـاوەدا پەلکێش کرد، یان ئەو گرنگیدانـەی ئێـوە بـە کەسـێکی وەکـی "ئـیبن خەلدون"، لە ناوجەرگەی شارسـتانییەتی ئـەورووپی و لـەم سـەردەمەدا لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟

**د. ئەلبێرت عیسا:** هەڵبژاردنی "ئیبن خەلدون" لەلایەن منەوە لەبەر گرنگی و ئەهمیەتی ئەوە... بۆ یەکەمجاریش کە خوێندکاری زانکۆ بووم لە

ئیتالّیا، بەشێوەیەکی ڕووکەش ئـەوم ناسـی. هەرچـەندە لێـرە و بـەر لـە سـەفەرکردنم بـۆ ئـەوروپا، کـەم تاکورتێـك هەنـدێ لـە بەرهەمـەکانیم خوێندبووەوە. ناسینی "خەلدون" وایلێکردم و لەو جیاوازییانە بگەڕێم کە لەنێوان ئەو و سۆسیۆلۆژیستەکانی سەردەمی نوێدا هەن... هـەروەها بـۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی تیۆری لەسەر کۆمەڵگاکان، ئـەم یـەکێك بـوو لەوانەی سەرنجی ڕاکێشام و پێم وابوو شتی نوێی لەوبارەیەوە وتووە. یاخود کۆمەڵە شتێکی هەیە کە دەکرێت نوێ بکرێنـەوە و سـەرلەنوێ لـەمڕۆدا کەڵکیان هەبێت لە بواری کۆمەڵناسیدا، چونکە دیدوبۆچوونەکانی تەنها شتێك نین بۆ قۆناغی خۆی دەست بدەن و تایبەت بن بە باکووری ئەفریقیا و ڕۆژئـاوای عـەرەبی، بـەڵکو دەکرێـت لەمڕۆشـدا بـۆ شـیکردنەوە و تـاوتوێکردنی واقیعـی کۆمـەڵگاکانی ڕۆژهـەڵات و لـە ناویشـیاندا بـۆ کۆمەڵگای کوردی بەکاربهێنرێت.

**شـوان ئەحمـەد: تـا ئـەمڕۆش زۆرێـك لەوانـەی سـەرقاڵی مێـژووی سۆسیۆلۆژیان، کۆك نین لەسەر ئەوەی کە ئایا کێ لـە داڕشـتنی بـەردی بناغەی ئەم زانستەدا دەستپێشخەر بـووە. ئەگەرچـی لای هەنـدێك ئـەم مەسەلەیە بڕاوەتەوە و بیریارێکی وەك "ئۆگەست کۆنت" بەسەر مەشق و دامەزرێنەری ئەم زانستە دادەنێن، بەڵام بایی ئەوەنـدەش دەنگـی دژ بـەم بۆچوونە لەئارادایە کە پێی وایە "ئیبن خەلـدون" یەکـەم دامەزرێنـەری سۆسیۆلۆژیایە و دەستپێشخەری لەم بوارەدا بـۆ ئـەو دەگەڕێتـەوە، نـەك کەسێکی تر. هەرچەندە ئەو لەبری ناوی سۆسیۆلۆژیا (علـم العمـران)ی**

**کردبێتە ناوی ئەو زانستە تازەیە. سەبارەت بەم مەسەلەیە ئێوە چی دەڵێن؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** ڕاستیت دەوێت من لای خۆمەوە هیچ یەك لەو دوو بۆچوونەم پێ پەسەند نییە. لەبەر هۆیەکی سەرەکی کە هەموو جار دەیلێمەوە، ئەویش ئەوەیە (هیچ شتێك تائێستا نەوتراوە کە لەوەوپێش نەوترابێت). بۆیە دامەزراندنی زانستێك و هێنانەئارای کایەیەکی زانستی لەلایەن بیرمەند و زانایەکەوە زۆر زۆر لاوازە. سەیرکردنی ئێمە بۆ هەر زانستێك کە دروستکراوی تەنها کەسێکە، سەیرکردنێکی هەڵەیە. زانستی کۆمەڵناسیش وەك هەر زانستێکی دیکە (سیاسەتناسی، جوگرافیاناسی، ئابووریناسی، فیزیك، کیمیاو... هتد)، جۆرە وەزیفەیەکیان هەیە کە پێی دەوترێت کەڵەکە بوون (تراکمی). واتە ئەم زانستانە قۆناغ دوای قۆناغ کەڵەکە دەبن و لەپڕێکدا و لەناکاو دروست نابن. ئەم زانستانە دوای کەڵەکەبوونیان پەرەدەسێنن و پاش ماوەیەك سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرن و فۆڕمی تایبەت بەخۆیان دەبێت. بۆنموونە لە کۆندا کاتێك مرۆڤ بیری کردووەتەوە لە بوونی خۆی (لە هەموو بارەیەکەوە باسی لێکردووە). سەیری کتێبەکانی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی گریك بکە، وەك: "ئەفلاتون" و "ئەرستۆ" دەبینیت (فیزیا، کیمیا، فەلسەفە، پیسکۆلۆژیا، سۆسیۆلۆژیا، سیاسەت ناسی... و هتد) تێدایە، بەڵام دواتر هێدی هێدی هەریەك لەمانە سەربەخۆی خۆیان وەردەگرن و جیادەبنەوە. یەکێك لەو زانستانەی توانیویەتی سەربەخۆیی

خۆی وەردەگرێت (بەڵام زۆر درەنگ و لە سەدەی هەژدەدا)، زانستی سۆسیۆلۆژیایە.

ئەگەر ئێستە بگەڕێمەوە سەر پرسیارەکەت و بەوە وەڵامت بدەمەوە کە ئەم یان ئەو دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژیا و سەر مەشقی ئەو زانستەیە، ئەمە شتێکە من لەگەڵیدا نیم و باوەڕم پێی نییە، بەڵام دەکرێت بڵێین بەڵێ "ئۆگەست کۆنت" بەڕەسمی وەکی دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژیا دەدرێتە قەڵەم، چونکە ئەو یەکەمین کەسە کە ناوی ئەم زانستە تازەیە دێنێتە ئارا و ئەم ناوەی لێ دەنێت. وەکی زۆر جاری تر باسم لێکردووە "کۆنت" پێشتر ناوی (فیزیکی کۆمەڵایەتی) لە زانستەکەی نابوو، بەڵام کاتێك زانیویەتی کابرایەکی پسپۆڕ لە بواری (ئامار)دا کە ناوی "ئەدۆلف کتلك"ەو زاراوەی (فیزیکی کۆمەڵایەتی) بەکارهێناوە، ناوەکەی گۆڕیوە بە سۆسیۆلۆژیا، بەڵام گەر بێت و ئێمە ئەم گریمانەیە وەلاوەنێین و گریمانەی یەکەم وەرگرین کە مەسەلەی (تراکمی)ە، دەتوانین بڵێین "ئیبن خەلدون" کاری زۆری کردووە لە پەرەپێدان و بەرەوپێشبردنی سۆسیۆلۆژیادا. هەروەها دەتوانم بڵێم (ئەگەرچی هەوڵەکانیشی بەشێوەیەکی ستماتیکی نەبووە)، بەڵام بەشدارییەکی زۆر و کاریگەری کردووە لە مەسەلەی تەرحکردنی دید و بۆچوونی کۆمەڵایەتیدا.

**شوان ئەحمەد: یەکێك لەو کایە گەورە و گرنگانەی "ئیبن خەلدون" بایەخی پێداوە و ڕووبەرێکی بەرفراوانی بیرکردنەوەی ئەویان داگیرکردووە، بواری (مێژوو)ە. ئەمانەوێت بزانین دەستبردنی ئەم پیاوە بۆ ئەم کایەیە**

لەپێناوی چیدا بووە، چونکە وەکی لای هەموان ڕوون و ئاشکرایە، بایەخدانی گەورە مێژووناسانی ئیسلام بەمێژوو لەپێناو شتێکی تردا بووە. واتە گرنگیپێدانی ئەوان بە مێژوو دواجار لەپێناو مەرامی (سیاسی) یان (ئاینی)دا بووە، نەك مێژووی خۆی، بەڵام ئەی ئاخۆ گرنگیدانی "خەلدون" بە چ مەبەستێك بووە؟

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، دەمەوێت ئاماژە بۆ خاڵێکی زۆر گرنگ بکەم، ئەویش ئەوەیە تێڕوانینی "ئیبن خەلدون" تێڕوانینێکی هەمەلایەنە و لە زۆر بەشدایە و زۆر کایەی جیاجیا دەگرێتەوە... دەتوانرێت لە تێڕوانینەکانی ئەودا هەریەك لە بواری: (ئەنسرۆپۆلۆژیا، ئەنتۆلۆژیا، سۆسیۆلۆژیا، جوگرافیا، فیزیك، جوگرافیای ئینسانی و ئابووری) بدۆزرێتەوە. هەروەها دەشتوانین مێژوو بدۆزینەوە، لەگەڵ فەلسەفەی مێژووشدا.

"ئیبن خەلدون" لەسەر هەموو ئەو بوارانەی نووسیوە. هەروەها گەر سەیری کتێبەکانی دیکەی بکەین بێجگە لە (المقدمة)، دەبینین باسی مێژووی کرۆنۆلۆژی کردووە، واتە مێژووی ڕووداوەکان. تەنانەت بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆژی مێژووی وڵاتانی مەغریبی عەرەبی و ئیسلامی شی دەکاتەوە، بەڵام لە کتێبی (المقدمة) و لە پێشەکییەکەیدا کە نزیکەی پانزە لاپەڕەیەك دەبێت و تەرخانی کردووە بۆ پێشکەشکردنی (المقدمة) خۆی، زیاتر باس لە مەسەلەی فەلسەفەی مێژوو دەکات، نەوەك کرۆنۆلۆژیای مێژوو یاخود ڕووداو. پاشان دەبینین ڕەخنەگەلێکی زۆر ئاڕاستەی مێژوونووسانی بەر لە خۆی دەکات، بۆنموونە وەك "الطبری،

المسعودي"، بەلآم بابزانین شێوەی ئـەو ڕەخنانـە چـین و بۆچـیی ڕەخنـەیان لێدەگرێت؟ ڕەخنەی ئەو لەبەر ئەوەیە کە مێـژوو لەوەوبـەر بەشـێوەیەکی کرۆنۆلۆژی نووسراوەتەوە، واتە تەنها ڕووداوەکان تۆمارکراون. ڕووداوەکـان چی بوون، کاتەکەیان کـەی بـووە؟ بـەبێ ئـەوەی خۆیـان بـەوەوە مانـدوو کردبێت کە لە هۆکاری (خـۆیی و نـاوەکی) ئـەو ڕووداوانـە بکۆڵنـەوە و بەدواداچوونی بۆ بکەن.

"خەلدون" پێی وایە مێژوونووس بەر لەوەی دەسـت بـە نووسـینەوەی ڕووداوەکـان بکـات، پێویسـتە گرنگییـەکی زۆر بـە دەستنیشـانکردنی هۆکـاری ڕووداوەکـە بـدات. لـە زانسـتی تـازەی ئەمڕۆشمانـدا بـاس لـە مەسەلەی هۆکار و سەرەنجام دەکرێت، ئەویش لە نووسـینەکەیدا تەئکیـد لەمە دەکاتەوە. واتە "خەلدون" لێرەدا باسی شتێکی گرنگ دەکـات کـە لە سۆسیۆلۆژیای "ڤیبەر"دا هەیە. وەك دەزانن "ماکس ڤیبەر" یەکێکـە لە مەزنە بیریارەکانی بواری سۆسیۆلۆژیا. "ڤیبەر" باسی لەوە دەکرد ئێمە چۆن دەتوانین لە مێژووی ڕابردوو بدوێین و لـەو دیـاردە کۆمەلآیەتییانـەی ئەو سەردەمانە تێبگەین؟ ئەو پێی وابـوو بـۆ تێگەیشـتن لـەوە پێویسـتە توانای ئەوەمان هەبێت لەناو ئەو ڕووداوانـەدا بـژین، واتـە ئـەو هەسـتە سایکۆلۆژییەمان هەبێت بۆ ئەوەی خۆمان بگەڕێنینەوە دواوە و هاوبەشـی ئەوە بکەین کە بە ئەلمانی پێی دەلێن Nacherledn. واتە "ڤیبەر" دەیەوێت بلێت ئێمە بۆ ئـەوەی لـە ڕووداوێکـی مێـژوویی و دیاردەیـەکی کۆمەلآیـەتی تێبگـەین، پێویسـتە لـە مەسـەلەی تێگەیشـتندا

Versthen بتـــوانین هاوبەشـــی ئـــەو ڕووداوە مێـــژوویی و دیـــاردە کۆمەڵایەتییانە بکەین.

لێرەوە گەڕانەوە بۆ سەر جیهانبینی و دید و تێڕوانینی "ئیبن خەلدون" گرنگە، چونکە ئـەو وەکـی "ڤیبـەر" دەڵێـت: (بـۆ ئـەوەی لـە ڕووداوە مێژووییەکان و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەین، پێویستە موعایەشە و هاوبەشی ئەو قۆناغ و سەردەمە بەسەرچووانە بکـەین، واتـە وەکـی ئـەوە وابێت خۆمان لەو کاتەدا ژیابین).

**شوان ئەحمەد: بەم قسانەی ئێوەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سەودا و مامەڵەکردنی "ئیبن خەلدون" لەگەڵ مێژوودا، تەنها ئەوە نـەبووە وەك کایەیەکی تۆمارکردنی ڕووداو و بەسەرهاتەکان لێی بڕوانێت، بەڵکو وەك کایەیەکی مەعریفی سەیریکردووە و وەهاش مامەڵەی لەگەڵدا کردووە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەڵێ، ئەو بـەر لـە هـەر شـتێ وەکـی ڕووداوێـك سەیری ڕووداوە مێژووییەکان دەکات، پاشان وەکی دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات کە پێویستە هۆکانی بدۆزرێتەوە. لەم بارەیەوە "ئیبن خەلدون" حەوت خاڵ دێنێتەوە، کە لێـرەدا هـەموویانم بیر نایەتەوە، بەڵام لە هەندێکیاندا دەڵێت: (یەکەم پێویستە مێـژوونووس هەموو ڕووداوێك ببەستێتەوە بە هۆکارێکەوە. دووەم: مەسەلەی فانتازیای خۆی، ئایا ئەم شتە لە ڕووی ئەقڵانییەوە ڕاستە یان نـا؟). ئـیتر بەڕاسـتی ئەوانی ترم بیر نەماوە.

**شوان ئەحمەد: دەکرێت بڵێین قسە و باسی "ئیبن خەلدون" دەربارەی مێژوو وەکی "هیگڵ" گشتگیر و گەردوونی نەبووە، بەڵکو تەنها تایبەت بووە بە قۆناغێکی دیاریکراو کە سەدەی چواردەیە و بە ناوچەیەکی دیاریکراو کە باکووری ئەفریقیا و وڵاتانی ڕۆژئاوای عەرەبییە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** لەم بارەیەوە دەتوانم بڵێم هەرچەندە "ئیبن خەلدون" بایەخی بە مێژووی باکووری ئەفریقیا و ڕۆژئاوای عەرەبی و جیهانی ئیسلامی داوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو هەوڵی نەداوە بۆ گشتاندنی سەیرکردنەکەی بۆ مێژوو. بۆ نموونە لە سەرەتای (المقدمة)دا باسی دەکات و دەڵێت: (ڕاستە من باسی مەغریبی عەرەبی دەکەم، چونکە شوێنی دیکەم نەبینیوە، بەڵام هەوڵمداوە بۆ دۆزینەوەی زانستێك کە زانستی عومرانە. لەڕێی ئەم زانستەشەوە هەوڵمداوە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان باس بکەم، مێژوو باس بکەم). واتە ئەو ویستوویەتی قەوارەیەکی گشتی مێژوو وەربگرێت، هاوکات ڕووداوە مێژووییەکان وەکی دیاردەیەك وەربگرین کە ئەگەری دووبارەبوونەوەیان لە جوگرافیایەکی تر و سەردەمێکی تردا هەیە.

لەبەر ئەوە ئەوەی ئەمڕۆ دەوترێت پێوەری (گشتاندن) واتە بە گشتیکردن، "ئیبن خەلدون" دەستێکی باڵای تێیدا هەبووە. ئەو باس لەوە دەکات، پێویستە مێژوونووس بەجۆرێك مێژوو شی بکاتەوە کە مەیلێکی گشتاندنی تێدابێت. سەبارەت بە بەراوردکرنی "هیگڵ"یش بە "ئیبن خەلدون" کە هەندێك نووسەر دەیکەن، بەڕای من کارێکە لەجێی خۆیدا نییە و هەڵەیە، چونکە بوارەکانیان زۆر لێك جیاوازە.

**شوان ئەحمەد: هەر سەبارەت بە مێژوو، ئایا دیدگای "ئیبن خەلدون" بۆ مێژوو دیدێکی ڕەشبین بووە، یاخود واقیع بینانە بووە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** من نازانم چ جیاوازییەك لەنێوان ڕەشبینی و بینینی واقیعدا هەیە... بەڵام گومان لەوەدا نییە کە "ئیبن خەلدون" بە یەکێك لە نووسەرە ڕەشبینەکان دەژمێردرێت، لە فەلسەفەی مێژوو فیکری سۆسیۆلۆژیادا. هەر لە سەرەتای (المقدمة)دا دەڵێت: (دەمەوێت هەموو شتێك باس بکەم، هەموو شتێك شی بکەمەوە، ئەوەی ڕوویداوە و ئەوەشی کە ڕوودەدات). واتە "ئیبن خەلدون" هەوڵی داوە لەڕێی ڕابردووەوە پێشبینی داهاتوو بکات. پاشان ڕووداوەکانی ئەو سەردەم و قۆناغەی تێیدا ژیاوە، وایان لێکردووە ڕەشبین بێت و بە دیدێکی ڕەشبینانە سەیری مێژووی بکات. بێگومان ژیانی تایبەتی خۆشی کاریگەری هەبووە لەسەر ڕەشبینی ئەو.

**شوان ئەحمەد: کەواتە هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی مەغریبی عەرەبی لە سەدەی چواردەدا، بە ئاستێك ناهەموار و شلۆق بووە کە کاریگەری سلبی لەسەر جیهانبینی "ئیبن خەلدون" جێهێشتووە و لە نووسینەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە... ئەم حاڵەتەش کەم تا زۆر لای هەریەك لە "نیکۆلۆ مەکیاڤیلی" و "تۆماس هۆبس" هەیە و هەلومەرجی ناهەمواری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئیتاڵیا و بەریتانیا لە سەدەکانی شانزە و حەڤدەدا، ڕەنگدانەوەی لەناو تێز و تیۆرەکانیاندا هەیە و کاریگەری لەسەر دنیابینی ئەوان دروستکردووە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بێگومان. تۆ دەزانی بەشێوەیەکی بابەتی هەموو نووسەرێك دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو هەلومەرجەی کۆمەڵگەکەی تیایدا ژیاوە و ئەو شتانە لە نووسینەکانیاندا ڕەنگ دەداتەوە. لەو سەردەمانەی "خەلدون"یشدا، لە ناوچەکانی مەغریبی عەرەبیدا و لێرەو لەوێ چەند قەبیلەیەك هاتوون و چوونەتە ناو پایتەخت و شارەکانەوە. ئەوانە بە عەسەبیەتێکی زۆر بەهێزەوە توانیویانە دەسەڵات بگرنە دەست، پاشان دوایی ئەوەی گەیشتوون بەخۆشی و کەماڵی ئیسراحەت عەسەبیەتی خۆیان بیرچووەتەوە و لاوازبوون. لە بەرامبەر ئەمەدا جارێکی تر لە ناوچە دوورەکانەوە قەبیلەیەکی تر بە عەسەبیەتێکی بەهێزترەوە، دێتە پێشێ و دەسەڵات دەگرێتە دەست... بێگومان هەموو ئەمانەش ڕۆڵی خۆیان هەبووە لە تێکدانی مەدەنییەت و ڕووخاندنی شارستانییەت، هەر لەبەر ئەمانەشە "ئیبن خەلدون" خۆی لە چەند لاپەڕەیەکی (المقدمة)دا شێوە تێڕوانینێکی سیکلی و بازنەیی هەیە بۆ ڕەوتی مێژوو.

**شوان ئەحمەد:** لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا باستان لەوە کرد کە "ئیبن خەلدون" کاتێك قسەی دەربارەی مێژوو کردووە، کەم تا زۆر هەوڵیداوە نەك هەر ڕابردوو بخوێنێتەوە، بەڵکو پێشبینی ئایندەش بکات، بەڵام ڕەنگە ئەم بۆچوونە لەگەڵ ڕای زۆر لەوانەی "خەلدون"ناسن پێچەوانە بێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان پێیان وایە فەلسەفەی مێژووی "خەلدونیزم" فیکرێکی تاك ڕەهەندە و ئەوەندەی پابەندی ڕابردووە مەیلی لەگەڵ ئایندە نییە. لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

**د. ئەلبێرت عیسا:** من بۆ خۆم لەگەڵ زۆر لەو نووسەرانەم کە دەڵێن: (پێشبینیکردنی ئاینده کارێکی زۆر گرانه و ناکرێـت)، بەتایبـەتی ئـەم مەسەلەیە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا و لە زانستە مرۆڤایەتییەکانـدا شتێکی زۆر زۆر زەحمەتە، بەڵام لێـرەدا یـەك خـاڵ هەیـە مـن دەمـەوێت جەختی لەسەر بکەم، ئەویش ئەوەیە کە تۆ دەڵێیت "خەلدونیزم" شـتێکە لەجێی خۆیدا نییە، چونکە "خەلدونیزم" وجودی نییـە. نـە لەبەرئـەوەی پێشبینکردنی بۆ داهاتوو هەڵەیە یان ڕاستە، بەڵکو "خەلدونیزم" وەکـی زاراوەیەك ئەگـەر بـەکاربهێنین مەبەسـتمان لـە ئایدیۆلۆژییەتێکـە، لـە کاتێکدا تێڕوانینی "خەلدون" "خەلدونییەتی" تێدا نییە. بۆ نموونـە وەك ئەوەی دەڵێین "مارکسیزم، لینینزم"، چونکە ئەمانە چەند تیـۆرێکن کـە لە داهاتوودا بوار بە پراکتیزەکـردن دەدەن، بـەڵام لـە مەسـەلەی "ئـیبن خەلدون" و ئەوەی پەیوەندی بەوەوە هەیە، من هـیچ شـتێك نـابینم پێـی بوترێت "خەلدونیزم". ئەگەرچی زۆر شت لە تێڕوانینی ئەودا دەبیـنم بـۆ کۆمەڵ و بۆ مێژوو.

**شوان ئەحمەد:** "ئیبن خەلدون" لە نووسـینەکانیدا و بەتایبـەتی لـە (المقدمة)کەیدا، گرنگییەکی بێ ئەندازە دەداتە هۆکاری جوگرافی و ڕۆڵی کەش و هەوا زۆر بە هێند وەردەگرێـت، لـەوەی کاریگـەری ڕاسـتەوخۆی لەسەر تاکەکەس و کۆمەڵ هەیە. بەم دواییانەش وتارێکت لـە گۆڤـاری (سەردەم) دەربارەی ئەو مەسەلەیە بڵاوکردەوە کە پێشتر بـە فەڕەنسـی و ئیتاڵی بڵاوبووەتەوە، تیایـدا بـاس لـە ڕۆڵ و کاریگـەری کـەش و هـەوا

دەكەیت لای هەریەك لە "ئیبن خەلدون" و "شارل دی مۆنتسكیۆ". دەكرێت بڵێین لەم مەسەلەیەدا "مۆنتسكیۆ" سوودی لەو بۆچوونانەی "ئیبن خەلدون" وەرگرتووە؟

**د. ئەلبێرت عیسا:** ئەو وتارەی نووسیومە لەسەر "مۆنتسكیۆ" و گوایە زۆر شتی لە "ئیبن خەلدون" وەرگرتووە، یاخود نا. من لەوێدا باسمكردووە كە كاتی خۆی چەند كەسێك لە ئێراندا بوون، لەوانەیە "مۆنتسكیۆ" بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ بیروباوەڕی "ئیبن خەلدون"ی لەوانەوە وەرگرتبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین دید و تێڕوانین و جیهانبینی مرۆڤ بۆ بوونی خۆی و بۆ دەوروبەری خۆی شتێكی فراوانە، بۆیە شتێكی زۆر سروشتییە "مۆنتسكیۆ" ئەوەی لە ئەورووپای سەدەی حەڤدەیەمدا وتبێت، "ئیبن خەلدون"یش لە باكووری ئەفریقیای سەدەی چواردەیەمدا باس لێكردبێت.

ڕەنگە لەم ڕووەوە هیچ پەیوەندییەك نەبێت، بەڵام بەم دیویشدا ڕەنگە پەیوەندی ڕاستەوخۆ، یان باڕاستەوخۆ هەبێت. من بۆ خۆم ناتوانم بەدڵنیاییەوە ئەو وەڵامە بدەمەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت ئەو تەریبییە لەم مەسەلەیەدا زۆر بە ئاشكرا لە نووسینەكانی "مۆنتسكیۆ"و لە (المقدمة)كەی "ئیبن خەلدون"دا تێبینی دەكرێت.

**شوان ئەحمەد:** ئێستا با بێینە سەر مەسەلەیەكی تر. یەكێك لەو زانستە تازانەی "ئیبن خەلدون" لە سەدەی چواردەیەمدا دەیهێنێتە ئارا، زانستی (عمران)ە، سەرەكیترین بابەتیش لە زانستی (عمران)دا چۆنییەتی

**دروستبوونی دەوڵەت و پاشان هەرەسهێنان و لەبەریەك هەڵوەشانیەتی. ئایا دەکرێت تەواوی زانستی (عمران)ی خەلدونی لەم مەسەلەیەدا گیر بدەین؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** نەخێر... بە بۆچوونی من تێڕوانینی "ئیبن خەلدون"و شێوەی شیکردنەوەی بۆ زانستی (عمران)، دوو تەوەری سەرەکی دەگرێتەوە:

**یەکەمیان:** لایەنێکی سیاسی، واتە مەسەلەی دەسەلات و دەوڵەت.

**دووەمیان:** مەسەلەی سۆسیۆلۆژیا، (کە بەڕاستی مەسەلەیەکی ئێجگار گرنگە).

با سەرەتا بەلایەنی (یەکەمیان) دەست پێ بکەین. ئەگەرچی یەکەمیان پەیوەندییەکی دیالەکتیکی بە قەوارە سۆسیۆلۆژییەکەوە هەیە، بەلام بۆ ئەوەی بەباشی تێبگەین، وا چاکە هەردووکیان لەیەکتر جیابکەینەوە و باسیان بکەین، پاشان هەردووکیان تێکهەڵکێش بکەین، چونکە بەم جۆرە دەتوانین لە تێڕوانینەکەی "ئیبن خەلدون" حالّی بین. "ئیبن خەلدون" لە شیکردنەوەی زانستی (عمران)دا دەڵێت: (بۆچی ئادەمیزاد لەگەڵ یەکتردا و لەناو کۆمەڵدا دەژین؟). لێرەدا ئەو بەر لە هەر شتێ "ئەرستۆ"، "ئەرستۆ تالیس" دووبارە دەکاتەوە، چونکە فەیلەسوفە کۆنەکان بەتایبەت "ئەرستۆ" تەئکید لەوە دەکەنەوە کە ئادەمیزاد کائینێکی سیاسییە، واتە بوونەوەرێکی کۆمەلایەتییە. ئەم پێناسەیە ئەوەمان پێ دەڵێت کە مرۆڤ ئارەزووی گردبوونەوە و

پێکەوەژیانی لەگەڵ ئەوانی تردا هەیە، هەر بەم شێوەیەش کۆمەڵ دروست دەبێت.

لێرەدا دەبینین "ئیبن خەلدون" شتێك دێنێتە ئاراوە کە مەسەلەی دەسەڵاتە و پەیوەندی بەو شتەوە هەیە پێشتر باسمان کرد (پێسیمیزم ڕەشبینی). ئەمەش لەسەر ئاستێکی میتۆلوژی دێت، وەك چۆن "تۆماس هۆبس" لە سەدەی حەڤدەیەمدا دەڵێت: (مرۆڤ گورگە بۆ برای خۆی). مرۆڤەکان هەموویان کۆدەبنەوە، بەڵام دواجار پێویستیان بە دەسەڵاتێکە. ئەگەر دەسەڵاتێك نەبێت چاودێریان بێت و دیسپلینیان بکات، ئەوا ئەوانە یەکتر دەخۆن و یەکتری لەناو دەبەن، ئیتر ئەوسا کۆمەڵ بوونی نابێت. لەبەر ئەوە ئادەمیزاد لە چوارچێوەی کۆمەڵدا، پێویستی بە دەسەڵاتێك هەیە. ئەم دەسەڵاتەش بۆ ئەوەی بەکاربێت و توانای کۆنترۆڵکردنی کۆی کۆمەڵگای هەبێت، پێویستی بە چەند مواسەفاتێك هەیە. وەك ئەوەی دەبێت (زانینێکی تایبەتی هەبێت و دەسەڵاتەکەی بەشێوەیەکی باش بەکاربهێنێت). لە هەموو ئەمانەس گرنگتر پێویستە ئەو دەسەڵاتە، (عەسەبیەت)ێکی تۆکمە و بەهێزی هەبێت. لێرەوە دێینە سەر باسی (عەسەبیەت)، دێینە سەر سێکوچکەی سۆسیۆلۆژی، یاخود پۆلیتۆلۆژی کە پێکهاتووە لە:

- عەسەبیەت.
- عمرانی بەدەوی.
- عمرانی شارستانی.

گرنگی تێڕوانینی "ئیبن خەلدون"یش بەگشتی لەمەدایە، لەم سێ کوچکەیەدایە.

ئەگەر بێت و مرۆڤ ئارەزووی هەبێت بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ئادەمیزادەکانی تردا و دەسەلاتێك هەبێت، ئەو دەسەلاتەش هەڵگری عەسەبیەتێك بێت (عەسەبیەتێکی بەهێز)، کەواتە ئەو دەسەلاتە بەدەستی ئەو تاکە کەسەوە دەمێنێتەوە کە عەسەبیەتێکی بەهێزی هەیە، بەلاّم شێوەی تێڕوانینی "ئیبن خەلدون" بۆ ئەم مەسەلەیە، شێوە تێڕوانینێکی (پێسمیزمە) واتە ڕەشبینانەیە. ئەو کاتێك دەبینێت کەسی دەسەلاتدار دەسەلاتی دەکەوێتە دەست و حوکم دەکات، دەکەوێتە ژیانێکی خۆشی و پڕ لە (تەرەف و بەزەخ)، ئیتر وردەوردە عەسەبیەتی خۆی بیر دەچێتەوە... سەرەتا پیاوی عەسەبیەتی بەهێز و خاوەن دەسەلات چی دەکات؟ دەست دەکات بەوەی تەواوی ئەندامانی عەسەبیەتەکەی خۆی، هەرچی خزم و کەسوکاری خۆیەتی لە دەوروبەری خۆی کۆدەکاتەوە و پلەوپایەیان دەداتێ. ئەمەش وادەکات هەموویان ژیانێکی خۆش و نەرمونیان بگوزەرێنن (لە خواردن، لە نووستن، لە مومارەسەکردنی سێکس... و)، لە هەموو شتێك ئیشباعێکی سایکۆلۆژی و کۆمەلاّیەتی و نەفسانی خۆیان بکەن.

تا ئەو ڕادەیەی وایان لێدێت، ڕابردووی خۆیان بیر دەچێتەوە. پەیوەندی بەهێز و تۆکمەی نێوان خۆیانیان بیر دەچێتەوە. بەم شێوەیە کاردەکەنە سەر عەسەبیەتەکەیان و عەسەبیەتەکەیان بەرەو لێکترازان و هەڵوەشان دەچێت. هاوکات عەسەبیەتێکی تازە دێتە ئارا، دێت و حوکمڕانی

دەگرێتە دەست. بەم شێوەیە مێژوو دووبارە دەبێتــەوە و دووبــارە دەبێتــەوە. لێرەدا زۆر گرنگــە چــۆن بتــوانین چــەمکی (عمرانــی بــەدەوی)، لەگــەڵ چەمکی (عمرانی شارستانی)دا شی بکەینەوە و بـزانین پەیوەنــدییان بــە عەسەبیەتەوە چییە.

بــەر لــە هــەر شــتێ ســەبارەت بــەم مەســەلەیە، "ئــیبن خەلــدون" پێناسەیەکی (عمرانی بەدەوی) دەکــات و دەپرســێت (عمرانــی بــەدەوی) یانی چی؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دیسانەوە دەگەڕێتەوە ســەر ئــەوەی (ئــادەمیزاد ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتییە؟)، ئەم کائینە پێویستی بە (خواردن و نووســتن و مەئوایەك) هەیە، پاشان خواست و خولیای گرتنە دەستی دەسەڵاتی لــەلا دروســت دەبێــت. ئــادەمیزاد (یــان خــەڵکی) لــە شــوێنێکی جــوگرافی دیاریکراودا دەژین کە خەریکی تێرکردنــی پێداویســتییە سەرەتاییەکانی خۆیــانن، واتــە ئــەوەی لــە ئابووریناســیدا پێــی دەڵــێن پێداویســتییە سەرەتاییەکان.

دواتر دەست دەدەنە کشتوکاڵکردن و پێکــەوە دەژیــن و هێــدی هێــدی پێکەوە گەورە دەبن. ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان عەسەبیەت و (عمرانــی بەدەوی)دا هەیە، ئالێرەدایە. "ئیبن خەلــدون" لێــرەدا و بــەر لــە هــەموو شتێك (ئەگەر بیروباوەڕەکــەی ڕێکبخرێــت)، پێناســەی عەســەبیەتت بــۆ دەکات... عەسەبیەت چییە؟ عەسەبیەت پێکهاتووە لەو پەیوەندییەی کــە لەنێوان کەسوکاردا هەیە. واتە یەکەم شت و یەکەم پەیوەندی بریتییە لــە (صلة الرحم)، واتە پەیوەندی هاوخوێنی لەناو ئەندامانی ئەو کۆمەڵــەدا.

ئەمە یەکەم پێکهاتەی عەسەبیەتە و (باوك و دایك و برا و خوشك) دەگرێتەوە، واتە کەسوکار دەگرێتەوە. لێرەوە دەتوانین بە سوودوەرگرتن لە دید و بۆچوونەکانی "ئیبن خەلدون"، کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان و کۆمەڵگای کوردی شی بکەینەوە.

وەك وتمان یەکەم پێکهاتە پێکهاتووە لە: (صلة الرحم)، هاوخوێنی. دووەم: (الحلف)، هاوپەیمانی. سێیەم: (الولاء). چوارەم: (الصداقة)، هاوڕێیەتی. یەکێك لەو مەسەلانەی لێکۆڵیاران فەرامۆشیانکردووە، مەسەلەی هاوڕێیەتی و برادەرایەتییە لە عەسەبیەتی "خەلدونی"دا. تۆ دەزانیت پیاوێکی وەك "ئەرستۆ تالیس"، یەك کتێبی گەورە و گرانی لەسەر هاوڕێیەتی نووسیوە؟ "خەلدون"یش زۆر بە گرنگی باس لەم پەیوەندییە دەکات و دەڵێت: (گرنگترین شت لەناو پێکهاتەی عەسەبیەتدا، هاوڕێیەتییە). بەڵام بۆچی؟ لە وەڵامدا دەڵێت: (لەبەرئەوەی پەیوەندی هاوخوێنی- الصلة الرحم- شتێکی ئەوتۆ نییە و وەهمییە، ئەوەی ڕاستە و حەقیقییە مەسەلەی هاوڕێیەتییە). هاوڕێیەتیش ئەوەیە کۆمەڵە کەسانێك لە چوارچێوەی قەبیلەیەکدا پێکەوە دەژین، پێکەوە یاریی دەکەن و پێکەوەش گەورە دەبن هاوبەشی خۆشی ناخۆش یەکتری دەکەن، چارەنووسیان پێکەوەیە... بۆیە زۆرجار مەسەلەی هاوڕێیەتی زۆر گرنگترە لە پەیوەندی هاوخوێنی.

لێرەدا شتێکی گرنگترە ماوە باسی بکەم، ئەویش ئەوەیە ئایا (ئایین) لە تیڕوانینی "ئیبن خەلدون"دا بە پێکهاتەیەکی عەسەبیەت دادەنرێت؟ دەتوانین لە زۆر شوێندا (لە زۆر نووسینەکانیدا) لەوە تێبگەین کە "ئیبن

خەلـــدون"، (ئـــايين) دانانێـــت بـــە پێکهاتەیـــەك لـــە پێکهاتـــەکانی عەسەبیەت... پێدەچێت "ئـیبن خەلـدون" کابرایـەك بوویێـت لەترسـی سەردەمی خۆی، زۆر جەختی لەسەر گرنگـی ئـایین نـەکردبێت و دەڵێـت: (ئایین زۆر گرنگ نییە). لەم بارەیەشەوە نموونـەت بـۆ دێنێتـەوە. ئـەوەتا دەڵێت: (محەمەد- پێغەمبەر- لـە بنەماڵـەی قـورەیش بـووە، ئەوانەشـی وەحی و ئایینی ئیسلامیان بڵاوکردووەتەوە و بە پشـتییەوە بـوون قـورەیش بوون). ئەگەرچی سەرەتا قورەیش دژایەتییان کردووە، بەڵام دواتـر ئـەوانن زۆر پشتگیری دەکەن.

**شوان ئەحمەد: بـۆ ئـەوەی لـە زانسـتی (عمـران) دوور نەکەوینـەوە، دەمەوێت بپرسم ئایا (ئیبن خەلـدون) بـە چـەمکی ئـاینیی مەسـەلەی پەیوەندی نێوان عەسەبیەت و (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارستانی) لێکداوەتەوە، یاخود بە چـەمك و زاراوەگـەلێکی دنیـای دوور لـە ئـایین (بەتایبەت ئاینی ئیسلام)، ئەو کارەی کردووە و بەو ئەرکە هەستاوە؟**

**د. ئـــەلبێرت عیســـا:** بـــەڕای مـــن هەرچـــەندە لـــە زۆر نووســـینی "خەلدون"دا ئاماژەیەکی وا هەیە بۆ خودا و پێغەمبـەر و... هتـد، بـەڵام ئەو بە چەمکێکی دنیایانە و دوور لە ئایین دیاردەکـانی شـیکردووەتەوە... وەکی عەلمانییەت نازانم، چونکە عەلمانییەت زۆر شتی لەسەرە، بەڵام ئـەو لە دەرەوەی ئایین ئەو شتانەی شیکردووەتەوە، چـونکە ئـەو خـۆی دەڵێـت: (زانست و مەسەلەی زانست لە دەرەوەی ئایینە).

**شوان ئەحمەد:** لە قسەکانی پێشووتردا باست لـە عەسـەبیەت کـرد، بەڵام بەدەر لەوانە دەکرێت بڵـێین: (عەسـەبیەت بریتییـە لـە هاوکـاری کۆمەڵایەتی، یان وەکی فەڕەنسییەکان پێناسەی دەکەن بـریتی بێـت لـە ڕۆحی گرووپ)، یاخود جیا لە هـەموو ئەمانـە عەسـەبیەت مانایـەکی شمولیتر و بەرفراوانتری هەیە؟

**د. ئەلبێرت عیسا:** من پێم باشە چەمکی عەسەبیەت بێ دەسکاری و وەکی خـۆی لـە هـەموو زمانـەکانی تـردا بەکاربهێنینـەوە و دەسـکاری نەکەین، لەبەر ئەوەی ئەو چـەمکە بەرهـەمی شـێوە بیرکردنـەوە و شـێوە کولتوورێکی تایبەتە... فەڕەنسییەکان پێی دەڵـێن ڕۆحـی گـرووپ و لـە هەندێ جێگەی تر دەیکەنە ڕۆحی قەبیلە. "ڕۆزنتاڵ" وەك هەستی گرووپ ناوی دەبات. من لەگەڵ ئەوەدانیم تەرجەمەیەکی حەرفی عەسەبیت بکرێت بۆ زمانەکانی دی، بەڵکو پێم چاکترە وەکی خۆی بەکاربهێنرێت.

سەبارەت بەوەی کە فەڕەنسـییەکان عـەسـەبیەت بـە ڕۆحـی گـرووپ، تەرجەمە دەکەن، من لە وتارێکمدا لە فەڕەنسا نووسیومە ڕۆحی گـرووپ نەك مـانای عـەسەبیەت ناگەیـەنێت، بـەڵکو ئـەنجامێکی عەسـەبیەتە و عەسەبیەت خۆی نییە. عەسەبیەت چەمکێکە پێکهـاتووە لـەو شـتانەی پێشتر باسـم کـردن، بـەڵام دەرەنجامەکـەی چـییە؟ ئـەوا ڕۆحـی گرووپـە. لەبەرئەوە لەگەڵ فەڕەنسـییەکاندا نـیم کـە زۆرجـار ڕۆحـی گـرووپ لـە بەرامبەر عەسەبیەتدا بەکاردەهێنن.

**شوان ئەحمەد: ئایا عەسەبیەت دیاردەیەکی سروشتی و گشتییە، یان تەنها تایبەتە بە چەند کولتوور و میللەتێکی دیاریکراو؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** ئەگەر جۆرە ئیعتبارێك بۆ مەسەلەی گەشەسەندن دابنێین، دەتوانم بڵێم عەسەبیەت دیاردەیەکە هاوشانی هەموو میللەتێکی کردووە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا. بۆ نموونە دەکرێت چەمکی عەسەبیەت بەسەر زۆر لە کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکاندا پراکتیزە بکرێت لە ئێستادا، بەڵام ئایا ئەوە بەسەر کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا پراکتیزە دەکرێت؟ لە وەڵامدا دەڵێم نەخێر، بەڵام بۆ کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان دەبێت و دەست دەدات.

**شوان ئەحمەد: هەندێك لە "خەلدون"ناسان باس لەوە دەکەن کە بەشێکی زۆری (المقدمة) دوور و نزیك پەیوەندی بە سۆسیۆلۆژیاوە نییە... ئەمەش کتێبەکەی "ئۆگست کۆنت" دەربارەی فەلسەفەی پۆزەتیڤستی بەراورد دەکەن کە بەشێکی زۆری پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە سۆسیۆلۆژیا و زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە نییە؟**

**ئەلبێرت عیسا:** دەتوانم بڵێم (وەك لە سەرەتاشدا باسم کرد)، (المقدمة)ی "ئیبن خەلدون" تێکەڵییەکە لە زانستەکان. هەرچەندە بەشێوەیەکی سستماتیك ڕێك نەخراون و چارەسەر نەکراون. سەرەڕای ئەوەش دەتوانین زۆر بەچاکی بەشداری "ئیبن خەلدون" لە بواری سۆسیۆلۆژیادا ببینین. بۆ نموونە ئەو سێ کوچکەیەی کە باس لە (عەسەبیەت) و (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارستانی) دەکات،

بەراورد دەکرێت بە دید و تێڕوانینەکانی زۆر لە سۆسیۆلۆژیستەکانی ئەوروپا، بەتایبەت کەسانی وەك: "ئۆگەست کۆنت"، "ئەمیل دۆرکایم"، "تۆینس"و کۆمەڵناسانی تر.

**شوان ئەحمەد: هەر سەبارەت بە کتێبی (المقدمة)، ئەوەی جێی سەرنجە لەو کتێبەدا بۆ هەرکەسێك دەست بە خوێندنەوەی بکات، ئەوەیە کە دووبارەبوونەوەی بێ ئەندازەی تێدایە... ئایا دووبارەکردنەوەی زۆری ئەو شتانە لە زیاد لە جێگایەکدا، لە ئاستی زانستی و گرنگی ئەو کتێبە کەم ناکاتەوە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەدڵنیاییەوە، کتێبی (المقدمة) پڕیەتی لە دووبارەبوونەوە. هەروەها بە زمانێك نووسراوەتەوە زۆر زەحمەتە. پێویستە پێنج شەش جار بیخوێنیتەوە، بۆ ئەوەی تێی بگەیت. من بۆ خۆم هەندێك لە تێکستە فەڕەنسی و ئینگلیزییەکەیم خوێندووەتەوە، بۆ هەندێك شت کە لێی نەگەیشتووم. تەنانەت خاڵبەندیشی تەواو نییە، ڕەنگە بەدرێژایی شەش حەوت لاپەڕە تەنها فاریزەیەك یان نوختەیەك ببینیت. بێگومان زۆر دووبارەکردنەوەی شتەکان لە نرخی ئەو کتێبەی کەمکردووەتەوە، بەلام دەبێت تێبگەین کە ڕۆحییەتی نووسین لەو سەردەم و قۆناغەدا بەو شێوەیە بووە.

**شوان ئەحمەد: با قسە لە پەیوەندی "ئیبن خەلدون" بە سۆسیۆلۆژیای نوێ و سۆسیۆلۆژیستە تازەکانەوە بکەین. ئایا "خەلدون" لە چیدا لەگەڵ**

**"ئۆگەست کۆنت و ماکس ڤیبەر و ئەمیل دۆرکهایم"دا یەکدەگرێتەوە و لە کوێدا لێیان جیادەبێتەوە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** وەك سەرەتایەك بۆ ئەوەی بتوانم بەباشی ئەو مەسەلەیە بگەیەنم، دەگەڕێمەوە سەر سەرەتاکانی دامەزراندن و دروستبوونی زانستی کۆمەڵناسی. کۆمەڵناسی لە سەرەتای دامەزراندنیدا باسی لە مەسەلەیەکی گرنگ کردووە، ئەویش گەشە و پێشکەوتنی کۆمەڵە. وەك ئەوەی چۆن کۆمەڵ لە ڕابردوودا بەرەوپێش چووە و چۆن گەیشتووەتە ئەم ڕادەی پێشکەوتنەی ئێستای؟ بۆ نموونە گەر سەیرێکی "ئۆگەست کۆنت" بکەین، ئەو کۆمەڵمان لەسەر ئاستێکی زەمەنی بۆ پێناسە دەکات کە بەسێ قۆناغدا تێپەڕبووە:

- قۆناغی تیۆلۆژی.
- قۆناغی میتافیزیکی.
-قۆناغی زانستی (یان پۆزەتڤستی).

هەروەها "ئەمیل دۆرکایم" کە کۆمەڵناسێکی مەزنە، ئەویش پەرەسەندنی کۆمەڵ بەشێوەیەك پێناسە دەکات کە پشت بەدوو چەمکی سەرەکی دەبەستێت و بریتین لە: هاوکاری میکانیکی و هاوکاری ئۆرگانیکی. هاوکاری میکانیکی خەسڵەتی تایبەتی قەبیلەیە، هاوکاری ئۆرگانیش خەسڵەتی تایبەتی کۆمەڵگەی تازەیە. کۆمەڵناسی ئەڵمانیش "توێنس"، ئەویش پەیوەندییەك دەدۆزێتەوە لەنێوان (کۆمەڵ) و (کۆمەڵگە)دا (Socity Community). "تۆنیس" لێرەدا ئەوە باس دەکات کە چۆن (کۆمەڵان) بەتایبەتی کۆمەڵی ئەورووپی پەرەیان

ســەندووە، لــە فــۆڕمێکی (Community) کــە ئەمــە لای "ئــیبن خەلــدون" لــە بەرامبــەر (عمرانــی بــەدەوی) دایــە، بــەرەو فــۆڕمێکی (Society) کە لەلای "خەلدون" دەکاتە (عمرانی شارســتانی). ئــەو پێی وایە (واتە توێنس) کە کۆمەڵ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا قــەوارەی زۆر بچوك بووەو لە یەکەیەکی جوگرافی بچــوکدا بــووە، واتــە پەیوەندییــەکی بــەتین هــەبووە لــەنێوان ئەنــدامانی کۆمەڵــدا و هــەموویان بەیــەکتری ئاشنابوون، بەڵام کاتێك کۆمەڵ وردە وردە تەشەنە دەکــات، هــەموو ئــەم ماکانە ون دەکات و دەستبەرداری زۆر لەو شتانە دەبێت.

دەتوانین ئەم شتانەش لە زانستی عمرانی خەلدونیدا بدۆزینەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیــە، مــرۆڤ بتوانێــت ئــەو لێکچــوون و بەراوردکارییانــە بەشێوەیەکی ورد و ڕێکوپێك بکات و بیاندۆزێتــەوە. بــۆ نموونــە چ جــۆرە لێکچوونێك هەیە لەنێوان (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارســتانی) لای "ئیبن خەلدون"، لەگەڵ (هاوکاری میکــانیکی) و (هاوکــاری ئۆرگــانی) لەلای "ئەمیل دۆرکهایم". ئێمە ئەگەر بمانەوێت ئەو دیاردانە بگشــتێنین، ئەوا نزیکایەتی و لێکچوونێك لەنێوان تێز و بەشکردنەکانی "خەلدون" و سۆسیۆلۆژیستەکانی دنیای تازەدا دەدۆزینەوە.

مۆدێرن، وەك کۆمەڵگاکانی ئەورووپی. واتە مەســەلەی هاوکــاتی... و هاوشوێنی گرنگە. ئەم مەسەلەیەش، واتە هاوکاتی و هاوشوێنی لە دید و تێڕوانینی "ئیبن خەلدون" بۆ (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارســتانی)، ئامادەیی خۆی هەیە.

هەر سەبارەت بەم مەسەلەیە، شتێکی زۆر گرنگ لای "ئیبن خەلدون" کە زۆر لە بیروباوەڕی کۆمەڵناسەکانی دواتردا دووبارە دەبێتەوە، ئەوەیە ئایا (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارستانی) قەوارەیەکی سۆسیۆلۆژی هاوکاتن، یاخود قەوارەیەکی سۆسیۆلۆژین کە لە فۆڕمێکەوە بۆ فۆڕمێکی تر پێش دەکەون؟ دوو خەسڵەتی سەرەکی لە فۆڕمی (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارستانی)دا هەیە: یەکەمیان ئەوەیە (عمرانی بەدەوی)، واتە کە ئادەمیزاد لەو قۆناغەوە پەرەدەسەنێت بەرەو (عمرانێکی شارستانی) دەچێت، یانی چی؟ یاخود ئەم دوو پێکهاتەیە لە یەك کات و شوێندا هەردووکیان پێکەوە هەن، واتە (عمرانێکی بەدەوی) بەتەنیشت (عمرانێکی شارستانییەوە). وەکو لە فیکری "ئەمیل دۆرکهایم"دا (هاوکاری میکانیکی هەیە) و (هاوکاری ئۆرگانیکی) هەیە. زۆرێك لە کۆمەڵناسان (هاوکاری میکانیکی) دەگەڕێننەوە بۆ کۆمەڵی تەقلیدی، وەك نموونەی کۆمەڵگاکانی خۆمان. (هاوکاری ئۆرگانیکمی)ش دەگەڕێننەوە بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن، وەك کۆمەڵگاکانی ئەورووپی. واتە مەسەلەی هاوکاتی... و هاوشوێنی گرنگە. ئەم مەسەلەیەش، واتە هاوکاتی و هاوشوێنی لە دید و تێڕوانینی "ئیبن خەلدون" بۆ (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارستانی)، ئامادەیی خۆی هەیە.

**شوان ئەحمەد: دەکرێت خاڵێکی هاوبەشی نێوان "ئیبن خەلدون" و "ئۆگەست کۆنت"، بەوە دەستنیشان بکەین کە هەردووکیان هێندەی**

گرنگییان بە گرووپ داوە، هێندە تاوڕیان لە تاکەکەس نەداتەوە. ئەوەندەی باسیان لە ئەهمیەتی کۆمەڵ کردووە، ئەوەندە قسەیان لە فەرد نەکردووە. ئایا "خەلدون" وەکی "کۆنت" دەکرێت لەبەرەی دژ بە Indivdualism حساب بکرێت؟

د. ئەلبێرت عیسا: نەخێر، ئەمە جیاوازە. لەبەرئەوەی ئەگەر لای "کۆنت" نەهیکردنێك هەبێت لە ڕۆڵی فەرد، بەلاّم ئیندۆڤیدیۆلیزمی تێدا هەیە... هەرچی دیدوبۆچوونی "ئیبن خەلدون" لەو بارەیەوە، خاڵییە لە ئیندۆڤیدیۆلیزم.

شوان ئەحمەد: "ئیبن خەلدون" یەکێکە لەو بیرمەندانەی لە پڕۆژەکەی خۆیدا باسی لە دەوڵەت و پێگەی ئەم دەزگایە کردووە لە چوارچێوەی کۆمەڵدا. ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا ئەوەیە، ئایا شێوازی بیرکردنەوەی ئەو لە دەوڵەت ئایینی بووە، یاخود دنیایی. ئەوەندەی هەڵوێستی ئەو لە دەوڵەت وەکی "مەکیاڤیلی" Secular بووە و داوای جیاکردنەوەی سیاسەتی لە ئاکار کردووە، ئەوەندەی بیریاران و قوتابخانە فیکرییەکانی جیهانی ئیسلامی وەکی "فارابی"و "اخوان الصفاء"، بەشێوەیەکی ئاینی لەو دەزگایەی نەڕوانیوە. لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

د. ئەلبێرت عیسا: من دەتوانم بڵێم تێڕوانینی "ئیبن خەلدون" بۆ دەوڵەت، هەمان تێڕوانینەیەتی بۆ عەسەبیەت. ئەگەر بێت و ئەو وەك چەمکێکی سەربەخۆ سەیری عەسەبیەت بکات لە ئایین، هەر بەوجۆرەش لە دەوڵەت دەڕوانێت، چونکە عەسەبیەت دامەزرێنەری دەوڵەتە. من

ئاوەهای لێ تێگەیشتووم و پێموایە تێڕوانینی ئەو بۆ دەوڵەت تایینی نییە، بەڵام لێرەدا دەمەوێت شتێك باس بکەم دەربارەی عەلمانییەت، چونکە پێموایە ئەو چەمکە بەهەڵە بەکاردەهێنرێت. عەلمانییەت چەمکێکی تازەیە و لەو باوەڕەدام ناتوانین زۆر بەکاری بهێنین، بۆ قسەکردن لەسەر تێڕوانینەکانی "ئیبن خەلدون".

**شوان ئەحمەد: "ئیبن خەلدون" دەوڵەت بە بەرەنجامی هێز دەزانێت. ئایا لەمەدا تا چەندە لە "جان بودان"ەوە نزیکە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** جا بۆ "جان بودان"؟ ئێمە دەتوانین بۆ ئەم مەسەلەیە لەناو فیکری سیاسی خۆرئاوادا بۆ کەسانی دیارتر و بەناوبانگتر بگەڕێین، بەتایبەت "تۆماس هۆبس"و "نیکۆلۆمەکیاڤیللی" کە دەکرێت هەندێك خاڵی هاوبەش و لەیەك چوو لەنێوانیاندا بدۆزینەوە.

**شوان ئەحمەد: ئێمە لەمڕۆدا چی لە "ئیبن خەلدون"ەوە فێر دەبین، گرنگی بیرمەندێك بۆ ئەمڕۆ چییە کە لە سەدەی چواردەیەمدا ژیابێت، حیکمەت لەوەدا چییە پیاوێك بهێنینە بەر باس کە ئەوەندە سەدە و ئەوەندە فرسەخ لە ئێمەوە دووربێت؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، بە قسەیەکی خۆی دەست پێ بکەم کە دەڵێت: (مێژوو پێکهاتووە لە ڕابردوو، لە ڕابردووەوە ئێمە ئێستا دەبینین، لە ئێستاشەوە دەتوانین داهاتوو ببینین). کەواتە ئەگەر

مێژوو بریتی بێت لە ڕابردوویەك کە دووبارە دەبێتەوە، دەتوانین لە زۆر کۆمەڵگای تەقلیدیدا تێڕوانینەکەی "ئیبن خەلدون" ببینین.

**شوان ئەحمەد: کارێکی گونجاوە "ئیبن خەلدون" لە ڕیزی ئەو بیرمەندانەدا پۆلێن بکرێت کە تیۆریایەکی دەربارەی ململانێی کۆمەڵایەتی هێناوەتە ئارا. ئایا لەم ڕووەوە نزیکتر نییە لە قوتابخانەی ململانێتی کۆمەڵایەتی تا قوتابخانەی وەزیفی؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بێگومان، بێگومان... "ئیبن خەلدون" بە یەکێك لەو بیرمەندانە دادەنرێت کە خاوەن بیروباوەڕی ململانێی کۆمەڵایەتییە. هەر لە سێکوچکە سۆسیۆلۆژییەکەیەوە بڕوانە، دەبینیت لەنێوان (عمرانی بەدەوی) و (عمرانی شارستانی)دا پێکدادان و بەریەککەوتن هەیە نەك هاوکاری.

**شوان ئەحمەد: حەز دەکەم کەمێکی تر باس لە مەسەلەی عەسەبیەت و ئایین بکەین. "ئیبن خەلدون" لە بەشی دووەمی (المقدمە) و بە دیاریکراوی لە لاپەڕە (٤٦٨)دا دەنووسێت: (بانگەوازی ئایینی بەبێ عەسەبیەت ناگاتە جێ، واتە ئایین ناتوانێت عەسەبیەت بەشێوەیەکی یەکجاری ڕیشەکێش بکات، بەڵکو تەنها کارێك کە بیکات بریتییە لەوەی عەسەبیەت لە چوارچێوەیەکی بچووك و بەرتەسکەوە بگوێزێتەوە ناو کایەیەکی گەورەتر و بەرفراوانتر)؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەڵێ، لەم بارەیەوە دەکرێت بڵێم گەربێت و ئایین پێکهاتەیەکی لاوەکی عەسەبیت بێت، ئەوا دەور و تەئسیری لەسەر ئەو مەسەلەیە هەر ئەوەندە دەبێت. "خەلدون" هەر لە لاپەڕەکانی (المقدمة)دا دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەڵێت: (محەمەد- پێغەمبەر- نەیدەتوانی پەیامەکەی بەرێتە پێشەوە، ئەگەر قورەیش نەبوایە). واتە لە عەسەبیەتدا لایەنە نائایینییەکەی لە لایەنە ئایینەکەی گرنگترە.

**شوان ئەحمەد:** با هەر لەناو (المقدمة)دا بۆ چەند پرسیارێکی تر بگەڕێین. لە لاپەڕە (٤٥٣)دا "ئیبن خەلدون" باس لە نەتەوەی عەرەب دەکات و ڕەخنەیەکی زۆر توند و زبریان ئاڕاستە دەکات و دەڵێت: (عەرەب نەتەوەیەکی دڕندەن و دەستیان بە هەرکوێیەك بگات وێرانی دەکەن... ئەوانە میللەتانێکن ڕزق و ڕۆزیان بە نوکی شمشێرەکانیانەوەیە... کەسانێکی ئیش نەکەرن و قوت و پارووی دەستی خەڵکانی تر دەڕفێنن). هەروەها لە جێگایەکی تردا دەنووسێت: (ئەهلی عیلم و زانست لە جیهانی ئیسلامیدا عەرەب نەبوون، بەڵکو تەواریان عەجەم بوون). ئەم سەیرکردنەی "ئیبن خەلدون" بۆ عەرەب چۆن لێکدەدەیتەوە؟

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەر لە هەر شتێ زۆر لە نووسەران پێیان وایە "ئیبن خەلدون" مەبەستی لە عەرەب (البدو من العرب)ەو لە عەرەب خۆی نییە. دواتر ئەم مەسەلەیە چۆن لێکدەدرێتەوە، ئەوا من دەیگێڕمەوە بۆ ئەوکەسەی خۆی "ئیبن خەلدون" دەخوێنێتەوە، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەگەر مەبەستی (البدو من العرب)یش بێت، ئەوا ئەوانیش هەر عەرەبن.

**شوان ئەحمەد: نەك هەر عەرەب، بگرە عەرەبی ئەقحاحیشن..؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** وایە، بەڵام ئەو لایەنە ئایدیۆلۆژییەکەی باس ناکات (واتە تەحقیرکردنی عەرەب وەکو عەرەب)، بەڵکو لایەنە زانستییەکەی وەردەگرێت. واتە (البدو من العرب) وەك پێکهاتەیەکی بەرهەمهێنان و وەکو قەوارەیەکی سۆسیۆلۆژی، وەکو قەوارەیەکی پۆلیتۆلۆژی سەیر دەکات. ئەو نەك هەر ئەوەندە بە عەرەب، بگرە زیاتریشیان پێ دەڵێت. بۆ نموونە کە دەچنە خانوویەکەوە دەست دەکەن بە ڕووخاندنی خانووەکە، بۆ ئەوەی تەختە و دارەکانی لێدەربهێنن و بیبەن بیکەنە کۆڵەکەی خێمەکانیان. تەنانەت لە قورئانیشدا ناوی (الاعراب) دێت وەك ئەوەی (الاعراب اشدو کفرا ونفاقا)، بەڵام هەرچۆنێك بێت (البدو من العرب) لە ڕووی پێکهاتەی سۆسیۆلۆژییەوە، بە مانای عەرەب دێت.

**شوان ئەحمەد: ئەم ڕەخنە توندانەی "خەلدون" ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، ئەو بە ڕەچەڵەك (بەربەر- ئەمازیغ) بووە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** من ناتوانم حوکمێکی وابدەم، چونکە ئەمە حوکمێکی زۆر قورسە. وەکی تریش باوەڕ ناکەم، لەبەر ئەوەی ئەو چوار ساڵی تەواو لە (قلعة سلامة) خۆی کێشاوەتەوە بۆ ئەوەی خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستی بێت و دووربێت لەو شتە لاوەکیانە.

**شوان ئەحمەد: ساڵێ ١٩٩٩ لە قاهیرە و لە سیمنارێك سەبارەت بە کار و بەرهەمەکانی "ئیبن خەلدون"، هەڵلایەکی گەورە دروست بوو. کاتێك یەکێك لە لێکۆڵیارانی ئەو سیمینارانە باسی ئەوەی کرد کە بەشێکی زۆری (المقدمة)ی "ئیبن خەلدون" لە (اخوان الصفا) وەرگیراوە و نووسینەکانی ناو ئەو کتێبە هیچ نییە جگە لە کۆپیکردنەوەی شتەکانی ئەوان. تا چەندە ئاگاداری ئەم مەسەلەیە هەیت و تاچەندەش ئەو شتانە ڕاست و دروستن؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەڕای من هەندێك لەیەکچوون لەنێوان نووسینەکانی "ئیبن خەلدون" و دیدوبۆچوونەکانی (اخوان الصفاء)دا هەیە، زۆر لێکچوونیش لەگەڵ "فارابی"، بەڵام ئایا "ئیبن خەلدون" فریای ئەوە کەوتووە هەموو ئەم نووسراوانە دووبارە بکاتەوە؟ من بڕوام وانییە.

**شوان ئەحمەد: کاریگەری چ فەلسەفەیەك بەسەر جیهانبینی "ئیبن خەلدون"دا زاڵە. فەلسەفەی یۆنانی، یاخود فەلسەفەی ئیسلامی؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** دەتوانم بڵێم هیچیان و هەردووکیشیان. هیچیان لەبەرئەوەی زۆر شتی تازەی وتووە، هەردووکیشیان لەبەرئەوەی هەندێك شتی وتووە کە لەوانیەوە وەرگرتووە.

**شوان ئەحمەد: سۆسیۆلۆژیای "ئیبن خەلدون" لە کامیانەوە زۆر نزیکە، سۆسیۆلۆژیای تیۆری، یاخود سۆسیۆلۆژیای ئەزمونگەری؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** دەتوانم بڵێم بەر لە هەموو شتێ تێڕوانینەکانی تێڕوانینێکی تیۆرییە. دوای ئەوەش بێگومان ئیمبرکیە، چونکە تەماشای کۆمەڵ دەکات بەو جۆرەی کە هەیە.

**شوان ئەحمەد: هەنوکە پرسیارێکی ترم هاتەوە بیر کە دەبوو پێشتر بمانکردایە، ئەویش ئەوەیە ئایا لای "ئیبن خەلدون" عەسەبیەت ئامانجە، یاخود ئامرازێکە بۆ گەیشتن بەدەسەڵات و دامەزراندنی دەوڵەت؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەر لە هەموو شتێك عەسەبیت ئامرازێکە، لەبەرئەوەی ئەو کۆمەڵەی دێتە سەر حوکم گەر خاوەنی عەسەبیەتێکی تۆکمە و بەهێز نەبێت ناتوانێت ئەو کارە بکات. هەروەها ئامانجێکیشە، چونکە کەسی فەرمانڕەوا بەهۆی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە زیاتر نفوزی خۆی گەورەتر دەکات و پەلوپۆی زۆرتر دەهاوێت. واتە دەتوانین بڵێین عەسەبیەت ئامرازە و ئامانجیشە.

**شوان ئەحمەد: ڕۆشنبیری دوورە وڵات کاك "مەریوانی وریا قانع" لە خوێندنەوەی کتێبێکی "محەمەد عابد جابری"دا، سەرنجمان بۆ لای گرنگی و ئەهمیەتی "ئیبن خەلدون" ڕادەکێشێت و دەڵێت: (خەلدونیزم نادیارێکی ترسناکە لە ڕۆشنبیری ئێمەدا)... ئایا ئاشنا نەبوونی ڕۆشنبیری کوردی بەم بیریارە مەزنە، تا چەندە زەرەرمەندە و غیابی ئەو تا چ ڕادەیەك ترسناکە؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** پێموایە واقیعی کۆمەڵگەی کوردی و ڕۆشنبیری ئێمە پێویستی بەزۆر زانست و بە زۆر بیرمەند هەیە، نەك تەنها "ئیبن خەلدون" بگرە چەندانی وەك ئەو... بەداخەوە لەم بارەیەوە ئێمە بەهۆی هەندێك بارودۆخی تایبەتییەوە، ئەو بوارەمان بۆ نەڕەخساوە وەکی میللەتانی تر بەشێوەیەکی فراوان بتوانین بەهەموو ئەو شتانەی دنیای فیکر و زانست ئاشنابین، یان بەشێوەیەکی سیستماتیك لە بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری و فەلسەفی تێبگەین. ئێمە پێویستمان بەوە هەیە زۆر لە کۆمەڵناس و مێژوونووسانی دنیا بەوانەی جیهانی عەرەبیشەوە، بناسین و واقیعی کۆمەڵگاکان خۆمانی پێ بخوێنینەوە، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە "ئیبن خەلدون"ەوە هەیە نازانم زۆر ترسناکە یاخود نا، ئەگەرچی دەزانم ئەو دەتوانێت یارمەتی باشمان بدات بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی فراوان و هەمەلایەن و سستماتیك، لە کۆمەڵی خۆمان تێبگەین. پێموایە ئەو شتەی لە سەدەی چواردەدا نووسیویەتی دەربارەی تەرکیبەی سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتی کۆمەڵانی ئەوکاتە، تاڕادەیەکی زۆر بەسەر قەوارەی کۆمەڵگەی کوردیدا پراکتیزە دەکرێت. بەڵێ، ئاشناکردنی "ئیبن خەلدون" بە واقیعی ڕۆشنبیری کوردی کارێکی پێویستە.

**شوان ئەحمەد:** مەوقعییەتی "ئیبن خەلدون" لە خۆرئاوا و لە زانکۆکانی ئەورووپا لە کوێدایە، تا چەندە ناوەندە ئەکادیمی و ڕۆشنبیرییەکانی ئەویٚ گرنگی پێدەدەن و قسەوباسی لەسەر دەکەن؟

**د. ئـەلبێرت عیسـا:** دەتـوانم بڵـێم هەرچـەندە خۆرئاواییـەکان دەستپێشخەربوون لە تەرجەمەکردنی نووسینەکانی ئەودا، بەڵام بەداخـەوە ئەو بایەخە پێویستەیان پێ نەداوە. ڕەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی: یەکەمیان لەوانەیـە هۆکـارێکی سـتروکتۆری بێـت، مەبەسـتم لەوەیە لە بیروبـاوەڕی "ئـیبن خەلـدون"دا سـەیر دەکـەیت شـیکردنەوەی کۆمەڵێك هەیە کە کۆمەڵێکی ئەورووپی نییـە، دووەمیـان ڕەنگـە هـۆی تێنەگەیشتنی "ئـیبن خەلـدون" بێـت، لەبەرئـەوەی دیـد و بۆچـوونێکە تایبەتە بـە کۆمـەڵانێك لـە سـەدەی چـواردەو پـانزەدا. دەکرێـت لێـرەدا هۆکارێکی دیکـەش سـەرباری ئەوانـەی پێشـوو بخـەم، ئـەویش شـێوەی پەروەردەیـە لـە ئـەوروپا. بەگشـتی سیسـتمی پـەروەردە لـە ئـەوروپادا بەشێوەیەکی (ئیرۆسەنتەریزمانە)یە، واتە بەزۆری جـەخـت دەکاتـە سـەر مێژووی ئەوروپا (بەتایبـەت مێـژووی یۆنـان و ڕۆمـان). لەبـەر هۆکـار گەلێکی واوەکی پێویست گرنگییەکی ئەوتۆی پێنەداوە.

هۆکاری ئاینیش دەوری خۆی هەیە، ئەگەرچی ئەو وڵاتانەش عـەلمانین، بـەڵام هەرچـۆنێك بێـت بەشـێوەیەکی بابـەتی قسـە بکـەین، پێویسـتە بیروبۆچوونەکانی "ئیبن خەلدون بـە هێنـد وەربگرێـت و تەنانـەت لـەناو زانکۆکانیشـدا بخوێنرێـت. لانـی کـەم بـۆ ئـەوەی ببێتـە پردێـك بـۆ نزیکخستنەوەی کولتوورەکـان و بەیەکگەیانـدنی خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا، بەتایبـەت لـەمڕۆدا کـە پرۆسـەی بـەجیهانیبوون بـەرەو ئاشـناکردنی کولتوورەکان بەیەکتری دەچێت. ئەمـەش کارێکـە مایـەی خۆشحاڵییە، چونکە هەموومان پێویستمان بە یەکترییە و پێویسـتە بەسـەر یەکتریـدا بکرێینەوە.

**شوان ئەحمەد: دوا پرسیارم ئەوەیە ئایا ئێوە، ئەو ماوەیەی لە زانکۆی سلێمانیدا خەریکی وانەوتنەوەن، تا چەندە هەوڵتان داوە بۆ ئەوەی خوێندکارانی زانکۆ بە "ئیبن خەلدون"و تێزە و تیۆرییەکانی ئەو ئاشنا بکەن؟**

**د. ئەلبێرت عیسا:** بەڵێ، بێگومان چەند جارێك هەوڵمداوە بیروبۆچوونەکانی "ئیبن خەلدون بۆ خوێندکارەکان باس بکەم، لە چوارچێوەی موحازەرەکانم و بۆ نموونە لە باسی تیۆری سۆسیۆلۆژیادا بەدوورو درێژی باسمکردووە... بەلاّم وەك دەزانیت ئەوەش پێویستی بە باکگراوندێك هەیە. ئایا قوتابییەکانی من ئەو باکگراوندە دەولّەمەندیان هەیە؟ ئەوە پرۆسەیەکی دوورودرێژە و پێویستی بە پشوودرێژیی هەیە. من هەولّمداوە و قوتابییەکانیش عەشقێکی خوێندنەوەیان لا هەیە، بەتایبەت لە دەرەوەی زانکۆ. ئەلّبەتە ئەمەش دەرەنجامێکی باش و ئیجابی دەبێت بۆ ئاشنابوون بە بیربۆچوونی "خەلدون"و بیرمەندانی دیکە.

# فەلسەفە، زانست، ئایدیۆلۆژیا

## د. شاهۆ سەعید

**شوان ئەحمەد: پرۆسەی فەلسەفاندن لای مرۆ کەی و بۆ دەستی پێکرد؟**

**د.شاهۆ سەعید:** پرسیارکردن دەربارەی سەرەتای سەرەتاکانی فەلسەفە، هەولێکە بۆ بە مێژووکردنی فەلسەفە. مێژووی فەلسەفەش خۆی لە خۆیدا بابەتێکە مایەی مشتومڕێکی زۆری فەیلەسوفەکان و لێکۆڵەرەوانی فەلسەفەیە، نەك لەبەرئەوەی لەسەر مێژوویەکی دیاریکراو کۆك نین، بەڵکو لەبەرئەوەی بە بڕوای بەشێکی زۆریان هەر دیدێکی مێژوویی بۆ فەلسەفە هەولێکە بۆ نیشاندانی وەك بابەتێکی ئارکیۆلۆجی، یان وەك ئەڵقەیەکی زەمەنی نێوان ئەفسانە و زانست... واتە وێناکردنی فەلسەفە وەك قۆناغێکی وەرچەرخانی مرۆڤایەتی، لە

ئەندێشەی میتافیزیکی غەیبانییەوە بۆ ئەندێشەی میتافیزیکی ئەقڵانی. دیوێکی تردا هەندێ جار دیدی مێژوویی بۆ فەلسەفە، قۆناغی گەشەی فەلسەفە (بەتایبەتی لای گریکەکان) دەکاتە قۆناغی پەڕینەوە لە ئەندێشەی نامەنهەجییەوە بۆ ئەندێشەی زانستیی مەنهەجی. واتە قۆناغی لەدایکبوونی میتۆد لە لێکۆڵینەوەدا، یان قۆناغی پەڕینەوە لە پسپۆڕیی تێکەڵ و هەمەلایەنەوە بۆ پۆلێنکردن لە پسپۆڕییەکاندا...

بۆیە ئەم دیدە مێژووییە بۆ فەلسەفە هەندێ جار (بەئاگابێت یان بێئاگا)، بایەخی فەلسەفە وەك وزەیەکی تێڕامان و وردبوونەوە و پرسیارکردنی بەردەوام، بەدەر لە سنوورە جوگرافی و مێژووییەکان لەبار دەبات و فەلسەفەمان وەك توحفەیەك لە بابەتی هەرەمەکانی میسر و باخچە هەڵواسراوەکانی بابل و دیواری چین نیشان دەدا. واتە بایەخی فەیلەسوفێکی وەك "ئەرستۆ" -بۆ نموونە- لەو سیاقەدا دەبین کە شارستانییەتی گریك و سوپای "ئەسکەندەر"ی بەرهەم هێناوە. لەکاتێکدا پەیوەندیی خوێنەرێکی فەلسەفە لەگەڵ "ئەرستۆ"دا، وەك پەیوەندیی مێژوونووسێك نییە لەگەڵ "ئەسکەندەری ماکدۆنیدا". لای مێژوونووسێك یان خوێنەرێکی مێژوو، بایەخی "ئەسکەندەر" بەندە بە کۆی ئەو بابەتە مێژووییانەوە کە قۆناغێکی دیاریکراو وێنا دەکەن، بەڵام لای فەیلەسوفێك یان قوتابییەکی زانستی لۆژیك دەقەکانی "ئەرستۆ" بەدەر لە سیاقە مێژووییەکانیان، خاوەنی ژیان و وزەی هەمیشەیی خۆیانن و لەگەڵ قۆناغە مێژووییەکاندا لە تازەبوونەوەدان.

بۆیە من زۆر جار کە فەلسەفەی سیاسیی "ئەرستۆ" دەخوێنمەوە و لە دیدی ئەوەوە تەماشای دۆخی شارێکی وەك سلێمانی دەکەم، دەبینم هەمان ئەو کێشانەی کە ئەو دەربارەی چەمکی شار و هاوشارییبوون لە ئەسینا هەیبووە، من لە شارەکەی خۆمدا هەمە و هەست دەکەم "ئەرستۆ" هاوڕێیەکمە دڵنەواییم دەکات و زۆرجاریش لەبری من بیردەکاتەوە، بەڵام ئێمە چەند سەرسام بین بەرامبەر کەسایەتی "ئەسکەندەر"، ناتوانین لە سیاقی مێژوویی خۆی دەریبهێنین و بیخەینە سیاقی مێژوویی خۆمان. دەکرێت وەك پاڵەوانی فیلمێك خۆشمان بوێت (واتە وەك بابەتێکی پەتی)، بەڵام ناتوانین وەك "ئەرستۆ" شوناسی لەگەڵدا بگۆڕینەوە.

ئەمەش ئەو تایبەتمەندییەی فەلسەفەیە کە خەسڵەتێکی (بان مێژوویی) پێدەبەخشێت. کاتێك دەڵێین (بان مێژوویی) زیادەڕۆیی ناکەین، چونکە مەبەستمان بوونی فیزیکی فەیلەسوفەکان نییە، بەڵکو مەبەستمان بوونی هیلامیی ئایدیاکانیانە کە هەمیشە خاوەنی گەرمی و وزەی خۆیانن. تەنانەت خودی مێژوو کاتێك مانا و بایەخ پەیدا دەکات کە وشە و ئایدیاکان لەدایك دەبن، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو مێژووانە زیندوون کە زۆرترین وشە و ئایدیای تێدا بەرجەستە بووبێت و تۆمارکرابێت. واتە ئەوە مێژوو نییە کە مانا بە ئایدیاکان دەبەخشێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوە وشەو ئایدیاکانن کە مێژوو دروست دەکەن.

لێرەوە هەندێك جار بە مێژووکردنی فەلسەفە گرفتی خۆی هەیە، بۆیە "دیکارت" لە شوێنێکدا ئامۆژگاریمان دەکات و دەڵێت: (بۆ ئەوەی فەلسەفە بناسین، دەبێت هەموو ئەو ئایدیا و زانیاری و فەلسەفانەی

پێشتر ناسیومانن، بخەینە بەرگومان و هەموویان لەبیر خۆمان بەرینەوە و سەرلەنوێ بیربکەینەوە). ئەو دژی هەموو ڕابردووناسییەك بوو بە مێژووی فەلسەفەشەوە، چونکە ڕابردووناسی بە دیوێکدا گرنگە کاتێ ئەو ئایدیانەمان پێدەناسێنێت کە هەن. بە دیوێکیشدا خەتەرناکە کاتێ دەبێتە ڕێگر لەبەردەم کرانەوەی ئاسۆی تێفکرینماندا، بەڕووی ئەو ئایدیانەدا کە دەکرێت ئێستا یان لە داهاتوودا بیانناسین.

"ئیمرسۆن"یش گەڕانەوە بۆ ڕابردووی فەلسەفە بە ڕێگرێك دەبینێت لەبەردەم لەدایکبوون و سەیرورەی فیکردا، چونکە سەلەفییەت و ڕابردووپەرستی شتێك نییە جگە لە دژایەتیکردنی سەیرورەی فیکر و جوڵەی زمان. فەلسەفەش لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کە فیکر مل نادات بۆ وەستان و زمانیش لە کاژفڕێدان ناکەوێت. "ئیمرسۆن" دەڵێت: (مێژوو فریومان دەدات و دەڵێت وەرن حەقیقەتم تێدا بدۆزنەوە و بمناسن، بەڵام سروشت لەناکاو بەئاگامان دێنێتەوە و دەڵێت: ئامان! وریابن باوەڕ بە ڕابردوو نەهێنین... ئەوە من لە ئێستادا و بە بەرچاوی خۆتانەوە جیهانتان پێدەناسێنم... بۆ ئەوەی بمناسن ڕاستەوخۆ تەماشام بکەن، نەك لە ڕێگای نێوەندە مێژووییەکانەوە).

ئەڵبەتە ئەم بۆچوونەی "دیکارت و ئیمرسۆن"یش ڕەتکردنەوەی ناسینی فەیلەسوفەکانی ڕابردوو نییە، بەڵکو ڕەتکردنەوەی ئەو پرۆسەی پۆلێنکردن و ڕیزبەندی و ڕێکخستنەیە کە مێژوو فێرمان دەکات، چونکە زانستی مێژوو باس لە بەهای ئایدیاکان- لەناو خودی خۆیاندا- ناکات، بەڵکو باس لەو سیاقانە دەکات کە بەها دەبەخشن بە ئایدیاکان. بۆیە

ئێمه گەر بە چاوی مێژوونووس تەماشای فیکر بکەین، ئەوا پێگەی "ڤۆلتێر" لە "کانت" گرنگترە، چونکە "ڤۆلتێر" بەدەر لە دەقەکانی، خۆی کارەکتەرێکی گرنگی سەدەی هەژدەی فەڕەنسا و ئەورووپا بووە، بەڵام ئەم مامەڵە مێژووییە لەگەڵ "کانت"دا ناکرێت، چونکە ژیانی ڕاستەقینەی ئایدیاکانی "کانت" لە دوای مەرگی فیزیکییەوە دەست پێدەکەن.

بەڵام با بگەڕێینەوە سەر کرۆکی پرسیارەکەی بەڕێزت: (فەلسەفەکەی دەستی پێکرد و بۆ دەستی پێکرد؟). گەر لە دیدێکی مێژووییەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، ئەوا پێویستە بڵێین: خودی مێژوونووسانی فەلسەفە سەبارەت بە دەستنیشانکردنی سەرەتای فەلسەفە کۆك نین. هەندێکیان بڕوایان وایە مێژووی فەلسەفە لە سەدەی شەشەمی پێش زایینەوە دەست پێدەکات، واتە ئەوان پێیان وایە فەلسەفە هونەرێکی گریکییە و لە "تالیس"ەوە دەست پێدەکات، بەڵام هەندێکی تریان پێیان وایە سەرەتاکانی ئەندێشەی فەلسەفە زۆر لەوە کۆنترە و دەگەڕێتەوە بۆ خۆرهەڵاتی کۆن، بەتایبەتی میسرییەکان و ئێرانییەکان و دانیشتووانی میزۆپۆتامیا. هەرچەندە فەلسەفە یان ڕاستتر دانایی و حیکمەت لای ئەوان، تێکەڵەیەك بووە لە حوکمی ئەفسانەیی و بەڵگەی ئەقڵی، بەڵام دواجار کاهین و دانیارەکانی ئەوان مامۆستای یۆنانییەکان بوون، چونکە سەرەتاکانی فەلسەفەی گریکی لە ئایۆنیا سەری هەڵداوە کە ناوچەیەك بووە لە پەیوەندی و کارلێکی بەردەوامدا بووە، لەگەڵ خۆرهەڵات و باشووردا، بەتایبەتی میسر و میزۆپۆتامیا و ئێرانی کۆن.

لەلایەکی ترەوە، کردنەوەی دەسخەتە هیرۆگلیفییە کۆنەکانی ئەو شارستانییەتانە، ئەوە دەردەخەن کە حیکمەت و هاوسەنگیی دەروونی خواستێکی سەرەکی خوێندەوارەکانی ئەوان بووە. هەروەها دوالیزمی (مادەو رۆح) یان جیهانی هەستپێکراو و ئایدیال لە تەوەرێکی سەرەکی ئەو فەلسەفەیە لە بواری ئەخلاقناسی و سیاسەتدا، بابەتێکی سەرەکیی خۆرهەڵاتییە کۆنەکانیش بووە، بەڵام گرنگی فەلسەفە لای گریکییەکان لەوێوە دەست پێدەکات کە مۆرکێکی زانستی وەردەگرێت و تا ئاستێکی زۆر لە حوکمی ئەفسانەیی دەربازی دەبێت. تەنانەت میتافیزیکی گریکی هەوڵی بەڵگاندنی ئەقڵانی دەدات بۆ شتەکانی ئەو دیو سروشت. هەروەها زمانناسی و لۆژیك بەتایبەتی لەسەر دەستی "ئەرستۆ"، پێشکەوتنێکی زۆر گەورە بەدەستدێنێت و بۆ یەکەمین جار دەرگا لە پۆلێنکاریی نێوان زانستی تیۆری و زانستی پراکتیکی دەکرێتەوە.

جگە لەوەی لەسەر دەستی فەیلەسوفە سروشتناسەکانی گریك و دواتر سۆفیستەکان "سۆکرات"، دانایی ناسی بۆ یەکەمین جار لە ئامۆژگاری و وتاربێژییەوە دەبێتە هونەری جەدەل و قەناعەت پێهێنان. واتە بۆ یەکەمین جار (وەرگر- گوێگر) دەکەوێتە قسەکردن و وتووێژ لەگەڵ (نێرەر- قسەکەر)دا. حیکمەت لە موڵکدارێتی یەقینەوە دەبێتە گەڕان بەدوای یەقیندا. نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە گرنگترین قۆناغی فەلسەفە لەگەڵ سەرهەڵدانی زاراوەی زمانەوانی (فەلسەفە)دا سەرهەڵدەدات، چونکە کەسی (دانا) بۆ یەکەمین جار دەبێتە (ئەو کەسەی بەدوای

یەقیندا ویڵە). بەو مانایەی دانایی وەك سیفەتێك لەناو خودی ئینساندا نامێنێت، بەڵکو دەبێتە خواستێك کە مرۆڤ هەمیشە بە شوێنیدا دەگەڕێت.

بۆیە ئەگەر یۆنانییەکان تەنها خاوەنی هونەری وتوویێژ و زاراوەی فەلسەفەبن، ئەوە بەسە بۆ ئەوەی فێری گەورەترین وانە ببین لێیان. بەلاَم من جارێکی تر هەقمە بڵێم پێویستە دیدێکی مێژوویی پەتیمان نەبێت بۆ مێژوو، چونکە ئێمە ئێستا لەم چرکەساتەی سەدەی بیستویەکدا، بەرلەوەی پێویستمان بە ئینتەرنێت و ئامێرە سیحرییەکانی عەولەمە بێت (وەك یۆنانییەکانی بەر لە بیستوحەوت سەدە)، پێویستمان بە فێربوونی سەرەتاکانی هونەری گفتوگۆ هەیە. پێویستمان بەوە هەیە کە خوێندکار و ئەندامانی خێزان و هاونیشتمانییەکانمان لە گوێگرەوە ببنە قسەکەر. مامۆستاکانمان و پیاوە گەورەکانمان لە کەسانێکەوە کە ئیدعای حیکمەت و ڕاستی دەکەن، ببنە کەسانێك کە بەدوای حیکمەت و ڕاستیدا دەگەڕێن.

(بەلاَم فەلسەفە بۆ دەستی پێکرد؟ واتە نیوەی دووەمی پرسیارەکەت)، لەبەرئەوەی دەرکپێکردنی نەزانی دەستی پێکرد. لەگەڵ لەدایکبوونی فەلسەفەدا مرۆڤ گەورەترین غرووری خۆی بریندار کرد، ئیعترافی بەوە کرد (کە نازانێت!). واتە ئەگەر مێژوونووسان باس لە برینە کۆسمۆلۆژی و بایۆلۆژی و سایکۆلۆژییەکان بکەن، کاتێ مرۆڤ بۆ یەکەمین جار هەستیکرد کە زەوی بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە "کۆپەرنیکۆس". بایۆلۆژیای مرۆڤ هەمان بایۆلۆژیای ئاژەڵە "داروین". ئەنگێزەکانی

نائاگایی زۆر بەهێزترن لە ئەنگێزەکانی ئاگایی "فرۆید"... ئەوا برینێکی زۆر گەورەتریان لەیادکردووە کە برینی فەلسەفییە. کاتێ مرۆڤ بۆ یەکەمین جار نەزانینی خۆی کەشف دەکات "سۆکرات". ئەو کەشفکردنەی کە "سۆکرات" دەباتە بەر پەتی سێدارە، چونکە غروری هەموو حەکیمەکان بریندار دەکات و پێیان دەڵێت: (منێك کە لە هەمووتان حەکیمترم، تەنها شتێك دەزانم کە نازانم!).

**شوان ئەحمەد: سەرچاوەی فەلسەفاندن چییە؟ تێڕامانی مرۆڤە لە دنیا "شوبنهاوەر"، یاخود هەستکردنە بە سەرسامبوون لە ئاست کەینونەدا "ئەفلاتۆن". یان گومانکردنە لەو شتانەی کە هەن "دیکارت"، یاخود لاوازی و دەستەوسانی مرۆڤە لە ئاست دیاردەکاندا "ئەبیکێت"؟**

**شاهۆ سەعید:** ئەڵبەتە دەبێت لە ئێستاوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، چاویلکەی مێژوویمان بۆ فەلسەفە فرێ بدەین... چونکە سەرچاوەکانی پرسیاری فەلسەفە مێژووکرد نین، بەڵکو هەمان ئەو پرسیارە کەینونیانەن کە دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێ دەمانورووژێنن. بۆ ئەوەی خاوەنی پرسیاری فەلسەفی بین، دەبێت خاوەنی هەستیارییەکی ئێستاتیکی بین نەك هەستیارییەکی لۆجیکی-مێژوویی.

ڕەنگە یەکەمین پرسیار لە تێڕامانی ئیستاتیکی هونەرمەندی دڕندەی سەرەتاییەوە دەستی پێکردبێت، کاتێ بەرامبەر تابلۆی سروشتێکی جەنجاڵ سەرسام دەبێت و پڕ بە گەرووی دەلوورێنێت. یان ئەو چرکەیە بێت کە مرۆڤ هەست دەکات وەك منداڵێکی هەتیو- بە تەعبیرە سارتەرییەکەی-

کەسێك، هێزێك، مامۆستایەك شك نابات نازی هەڵگرێت و وەڵامی ئەو پرسیارانەی بداتەوە کە لە ناخیدا گێنگڵ دەدەن... دواجار ناچار بێت خۆی (تەنها لای خۆیەوە)، لە چرکەساتی موجازەفەیەکی ترسناکدا تامی قوڕ و میوە، تینی ئاگر و خۆر ئەزموون بکات. نەك تەنها لە پێناو مومارەسەکردنی چێژێکی بایەلۆژی، بەڵکو لەپێناو مومارەسەکردنی چێژێکی تردا کە چێژی ناسینی شتەکانە، واتە چێژی مەعریفەیەکی سەرەتایی... ئەوا دەکرێت بڵێین سەرچاوەی فەلسەفاندن، زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ منداڵدانی مێژووی مرۆڤایەتی...

فەلسەفاندن لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کە مرۆڤ بڕیاردەدات جیا لە کائینەکانی تر، دووجار نەکەوێتە یەك تەڵەوە. ئەوانەی کە لە بواری فەلسەفەی جوانی و بەدیاریکراوی سەبارەت بە سایکۆلۆژیای ئەفراندن قسە دەکەن، پێیان وایە مرۆڤی ئەفرێنەر ئەو کەسە نییە کە تەنها سەرسامە بەرامبەر شتەکان، بەڵکو ئەو کەسەشە کە لە پشت ڕواڵەتی سەرسامییە سادەکانەوە بۆ سەرسامی قوڵتر دەگەڕێت... ئەو تێڕامانە بەردەوامەش بەرامبەر ئەو سەرسامییانەی کە سەرسامی تریان لێدەکەوێتەوە، سەرەتاکانی تێفکرینە. (هەر لێرەشدا دەتوانین جیاوازی لەنێوان نێرەری ئەفرێنەر و وەرگری ئاساییدا بکەین، بەوەی کە کەسی وەرگر تەنها یەك ڕەهەندی سەرسامی دەبینێت، بەڵام کەسی ئەفرێنەر زیاد لە ڕەهەندێکی سەرسامی دەبینێت... سەرسامییەك کە سەرسامی تری لێدەکەوێتەوە. واتە کەسی دووەم دەزانێت مرۆڤ و بەرد دوو جەوهەری جیاوازن، بەڵام کەسی یەکەم جگە لەوەی دەزانێت ئەو دوو شتە یەکێك

نین، ئەوەش دەزانێت کە خاڵی هاوبەش و خاڵی لێکترازانیان هەیە. واتە دەکەوێتە گەمەی دیاریکردنی لێکچوون و جیاوازی و بەراورد و قبوڵکردن و ڕەتکردنەوە و پێشکەشکردنی گریمانە و گریمانەی پێچەوانە و... هتدەوە).

مەعریفەی مرۆیی لەو شوێنەوە دەستی پێکرد کە مرۆڤ هەوڵیدا جگە لەو شتە مەحسوسانەی دەیبینێت، شتێکی تریش ببینێت کە بیرۆکە، وێناکردن، دیمەنە زەینییە ئەبستراکتەکانە... واتە ئەو مەخلوقە زەینییانەی جیا لە خۆر و بەرد و درەخت وێناکردنی زەینی (هەق، ڕاست، جوان... هتد)ن. واتە ئەوکاتەی مرۆڤ هەستی کرد دوو جۆر مەخلوق هەن، مەخلوقێك لە دەرەوەی کەینونەی خۆمان (مادە و دۆخەکانی) و مەخلوقێك لەناو کەینونەی خۆماندا (بیرۆکە و وێنەکانی)، هەموو مەعریفەی مرۆڤایەتیش هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا بریتییە لە کۆششێکی بەردەوام بۆ دۆزینەوەی هارمۆنی و پێکەوە گونجان لەنێوان ئەو دوو جۆرە مەخلوقەدا. بۆ نموونە پێکەوە گونجاندنی وێنەی دوو درەخت لە دەرەوەی مرۆڤ و وێنەی ژمارە (دوو) لە زەینی مرۆڤدا، سەرەتای سەرەتاکانی لەدایکبوونی ماتماتیك بوو... بەڵام ئایا چوونییەکیی ڕەها لەنێوان ئەو دوو مەخلوقەدا دروست دەبێت؟ "ئەنیشتاین" پێمان دەڵێت: نەخێر، چونکە بیرکردنەوە و وێناکردن ئەو مەخلوقە ئازادانەن کە لە دۆخێکی نەخەملیودان، بە پێچەوانەی ئەو مەخلوقانەی کە لە جیهانی دەرەوەدان.

دەکرێت بڵێین "فرانسوا هۆبێر" لە هەموومان زیاتر ئاشنای ئەو مەخلوقە زەینییانە بوو، لە هەمووشمان زیاتر توانای بەراورد و پێکەوە گونجانی ئەو مەخلوقانەی لەگەڵ مەخلوقەکانی دەرەوەدا هەبوو... چونکە ئەو لەگەڵ ئەوەی کەسێکی کوێر بوو، فیزیکستێکی گەورەش بوو، لەکاتێکدا فیزیا زانستی ئەزموونکردنی دۆخەکانی مادەیە... دەگێڕنەوە "هۆبێر" مادە و دۆخەکانی مادەی لە شێوەی هێمای زەینی لە خەیاڵی خۆیدا وێناکردووە و بەبێ ئەوەی لە ڕێگای دەست لێخشان و بینینەوە هەستیان پێ بکات، لە ڕێگای خزمەتکارێکی خۆیەوە هەموو هاوکێشە و گریمانە زەینییەکانی ئەزموونکردووە و توانیویەتی یاسای فیزیایی گرنگ کەشف بکات. واتە "هۆبێر" ڕۆڵی ئەقڵ و خزمەتکارەکە ڕۆڵی جەستەی بینیوە. "هۆبێر" هاوڕێیەتی مەخلوقە زەینییەکانی کردووە و خزمەتکارەکەش لەگەڵ مەخلوقە مەحسوسەکاندا ژیاوە.

لێرەوە دەکرێت بڵێین، فەلسەفاندن کاتێ دەستی پێکرد کە مرۆڤ یەکەمین گریمانەی زەینی بەرامبەر یەکەمین گریمانەی واقیعی ئەفراند. فەلسەفاندن بریتییە لە کێشمەکێشم و ململانێ لەنێوان ئەوەی کە دەیبینین و ئەوەی کە وێنای دەکەین. ئەگەر تۆ یەکەمین جارت بێت بەرامبەر سەعاتێکی چاڵمە دانیشیت، ئەوەی کە دەیبینیت و هەستی پێدەکەیت جوڵەی میل و دەنگی چرکە چرکەکانە، ئەوەیشی کە وێنای دەکەیت پێکهاتەی ناوەکی ئامێرکەیە، بەڵام ئایا چ جیاوازییەکی سەیر لەنێوان گریمانەکانی تۆ و گەوهەری ئەو شتەدا هەیە کە تۆ وێنای دەکەیت. فەلسەفە خۆی ڕازی نابێت لە جیهانی گریمانەوە بچێتە ناو

جیهانی ئەزموون، چونکە گریمانە ڕەهەندێکی مادیی نییە کۆتایی بێت، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئەزموونکردنێکدا زیاتر بەسەر خۆیدا دەکرێتەوە. واتە فەلسەفە مانەوەیە لە جیهانی سەرسامییەکی بێ سنووردا... ئەوکاتەشی سەرسامی سنووردار دەکرێت، ئەوەی دەبینێت و هەستدەکات کائینە بیرکەرەوەکە نییە، بەڵکو مەخلوقە مادییەکانن... بێگومان نموونەی "هۆبێر" و خزمەتکارەکەی وەك دوو ئیستعمارە وەردەگرم، چونکە مەرج نییە "هۆبێر" وەك مرۆڤێك تا سەر ئەو "هۆبێر"ە بێت کە ئێمە باسی دەکەین و خزمەتکارەکەش ئەو کەسە بێت کە ئێمە ناوی دەنێین. واتە ئەوکاتە یەکەمین مەعریفە لەدایك بوو کە مرۆڤ هەستی بە نیگەرانییەکی ترسناك، بەڵام بەچێژیش کرد، نیگەرانی جیابوونەوەی دوو جیهان: (خود/بابەت)، (زەینی/واقیعی)، (وێناکراو/ بینراو).

بۆیە هەندێ لە تیۆریسیانی مەعریفە بڕوایان وایە واقیع بریتییە لەو گریمانە مادییەی ئەقڵ پێشکەشی دەکات، تاکو لەو گریمانە زەینییەی جیابکاتەوە کە هێشتا نەخەملیوە. تەنانەت "ئیدوار لۆرۆ" دەڵێت: (ئەوەی کە ناوی واقیعە، بەرهەمی پەیمانێکی نێوان ئێمە و سروشتە)... دواتر مرۆڤ بۆ ئەوەی پارێزگاری لە سەرسامی دووەم بکات کە زادەی سەرسامی یەکەمە و سەرسامی یەکەمیشی لەیاد نەچێتەوە، پێویستە سەرسامی یەکەم ناوبنێت واقیع و ئەو زنجیرە سەرسامییەش کە لێی دەکەونەوە، ناوبنێت گریمانەی زەینی، بەڵام ئەم هەموو سەرسامییە بۆ؟ زادگای ئەم نیگەرانییە قوڵە/ بەچێژە، کوێیە؟ من لە یەکچوونێکی

• سەیر لەنێوان مرۆڤ وەك خاوەن کەینونەیەکی تاك و مرۆڤایەتی وەك خاوەن بوونێکی دەستەجەمعی دەبینم.

سەرسامیی مرۆڤی سەرەتایی بەرامبەر ژیـان و گـەردوون و مـەرگ و دیاردە سەیرەکان، هەمان سەرسامیی منداڵە بەرامبـەر ئـەو دیاردانـەی ئێمە ناومان ناون دیاردەی سروشتی. غـەریزەی بـە مـۆڵکردنی شـتەکان لەلایەن مرۆڤی سەرەتاییەوە کە حەوسەڵەی ئەمبارکردنی شت و شمەکانی نەبووە، سروشتی سرك و گەڕانی بەردەوام بە شوێن ئەو وەڵامانەدا کـە زۆر قووڵتر بـوون لـە پرسـیارە سـاناکانی ئـەو، هاوشـێوەی بێحەوسـەڵەیی و سرکیی ئەو کائینـە بچـووکە تیـژبین و سەرسـامەیە کـە ئێسـتا لـەنێو ماڵەکانماندا دەژی و پەی بـە عەبقەرییـەتی نابـەین. ئـەو کائینـەی کـە مەگەر هەر خەو چاوی گەڕان و نەسرەوتنی پێ لێکبنێت.

شـــاعیرییەتی مرۆڤـــی ســـەرەتایی لـــە ســـروتە فـــەردی و دەســتەجەمعییەکاندا، تــابلۆی ســـەر ئەشـــکەوتەکان (بەتایبــەتی هــی ئۆرکنیشیەکان) کە بریتین لە هەزاران هێڵ و خاڵ و نیشانەی وەك یـەك و دووبارەوە بوو، لە هەمان ئەو تابلۆیانە دەچێت کـە مرۆڤـە بچـکۆلەکەی ناومالّی خۆمـان دەینەخشـێنێت، کاتێـك پارچـە کاغـەز و قەڵـەمێکی دەدەینە دەست. لێرەوە لەبەرئەوەی هـیچ دۆکیۆمێنتێکمـان لەبەردەسـتدا نییە پێمان بڵێت سەرچاوەی سەرەتا دوورەکانی فەلسەفە لە کوێوە هەڵقوڵا (کە بێگومان مەبەسـتمان فەلسـەفەیە وەك خولیـا لـە قۆنـاغی پـێش لەدایکبوونی دەقدا)، ئـەوا هـیچ دەرەتانێـك شـك نابـەین جگـە لـەوەی گریمانەیەکی بەراوردکار پێشکەش بکـەین لـە نێـوان قۆنـاغی منـداڵی

مرۆڤایەتی و قۆناغی منداڵی مرۆڤ... واتە گەڕان بەدوای ئەنگێزە و خولیا فەلسەفییەکانی منداڵ، لەپێناو دۆزینەوەی دەزولە دێرینەکانی هەمان ئەو خولیا و ئەنگێزانە لای مرۆڤی سەرەتایی.

بەڵام داخۆ چ پەیوەندییەك لەنێوان پرسیاری فەلسەفی و پرسیاری منداڵانەدا هەیە؟! ئەڵبەتە لەنێوان منداڵ و فەلسەفە- وەك کایەیەکی ئەبستراکت کە ئێستا لەناو کتێبخانەکاندا ڕەفەی بۆ جیاکراوەتەوە- پەیوەندییەکی ئەوتۆ لەئارادا نییە، بەڵام لەنێوان منداڵ و گەوهەری فەلسەفە- وەك کایەیەك کە داوامان لێدەکات لە سەرسامییەکی بەردەوامدا بین و هەرگیز دیاردە و شتەکان بە ئاسایی و بە ئاسانی بە بەردەمماندا نەگوزەرێن. پەیوەندییەکی قووڵ و سەیر هەیە، چونکە هەرچەندە فەیلەسوفەکان لە کاتی شیکردنەوە و ئەنجامگیری لۆژیکدا کەسانێکی گەورە و بەتەمەنن، بەڵام لە کاتی تێڕامان و کردنەوەی خەیاڵداندا دەبنەوە بە منداڵ.

ئەگەر زاناکان بەوە لە فەیلەسوفەکان جیابکرێنەوە کە زیاتر ملکەچی پێوەرە قورسە پێشوەختەکانن. ئەگەر شاعیرەکانیش بەوە لە فەیلەسوفەکان جیابکرێنەوە کە زیاتر شەیدای دنیای فانتازیا و خەونە قوڵەکانن... ئەوا فەیلەسوفەکان بە دیوێکدا زانا و بە دیوێکدا شاعیرن. لە کاتی سۆراخی مەنهەجی و ئەنجامگیریی ئەقڵانیدا، پێڕەوی زۆربەی یاسا ساختەکان دەکەن کە هەندێکیان لە یاسای ماتماتیکی دەچن، بەڵام لە کاتی وردبوونەوە قوڵەکاندا بە شێوەیەك لە جوغزی یاسا کارپێکراوەکان دەردەچن و دەبنەوە بە هەمان ئەو بوونەوەرە پڕ شیعرییانەی جاران کە لە

ترسێکی تێکەڵ بە چێژێکی بێوێنەدا بوو، بەرامبەر باران و تیشك و ڕوخساری ئینسانەکان.

فەیلەسوف لەنێوان (ئەم دوو هێزەدا) کە یەکێکیان ئیغرای دەکات و پێی دەڵێت وەرە نێو ئێلی مرۆڤە گەورە و ئاقڵەکان، ئەوەی تریشیان لە ناخەوە زوو زوو بەئاگای دێنێتەوە و دەڵێت نەکەی بمدۆڕێنیت، وردە... وردە... لە پێگەی تایبەتی خۆیدا دەگیرسێتەوە. بۆیە هەندێ لە فەیلەسوفەکان (فەیلەسوفە زاناکانن)، وەك "ئەرستۆ"، دیکارت، گالیلۆ، نیوتن، ڕاسل". هەندێکیشیان فەیلەسوفە شاعیرەکانن، وەك: "ئەفلاتون، ڕۆسۆ، شوبنهاوەر، نیچە، بێرگسۆن...".

هەندێکیان لە یاسا چەسپیوەکانی لۆجیك و هەندێکیان لە یاسا نەخەملێوەکانی شیعرییەتەوە نزیکن، بۆیە یەکەمین وانە کە فەلسەفە فێرمان دەکات بریتییە لە ڕەواندنەوەی دوو وەهم: یەکێکیان (فەلسەفە) وەك زانستێکی ئەبستراکتی سەخت تەماشا دەکات کە دەبێت خاوەن دنیایەك مەرجی پێشوەخت بین بۆ ئەوەی نزیك تخوبەکانی بکەوینەوە، ئەوی تریشیان (فەلسەفە) وەك قسەگەلێکی خەیاڵی- ناواقیعی تەماشا دەکات کە زیاتر لە شیعرەوە نزیکە نەك زانست، بابەتەکانی لە خەیاڵدانەوە سەرچاوە دەگرن، نەك واقیعی دەرەوە. وەهمی یەکەم پیرۆزکردنی پرۆسەی فەلسەفاندنە، لە بەرامبەر بچووککردنەوەی ئینسان و کەمبایەخکردنی پرسیارە سەرەتایی و ساناکان کە منداڵدانی پرسیارە هەرە قوڵ و گەوهەرییەکانن. وەهمی دووەمیش کەمبایەخکردنی فەلسەفەیە بەرامبەر ئەو غرووره ساختەیەی مرۆڤی هاوچەرخ دووچاری

هاتووه که هەندێ لـه پۆزەتیڤیسـت و ئەکادیمییـەکانیش زۆر ترسـناکانه کاری بـۆ دەکـەن: بـەوەی دەبێـت ئێمـه واقیعـی بـین و یاسـا زانسـتییه (سـەلمێنراوەکان!)، بکەینـه پێـودانگ و هێنـده تەسـلیمی ئـەنگێزه نەخەملێوەکانی ناخی خۆمان نەبین

ڕەنگه قۆناغێك له توێژینـەوەی تیـۆری ئەبسـتراکت لـه فەلسـەفەدا هەبێت که پێویستی به پاشخانێکی فیکریی قوول هەبێت، پێویسـتی بـه بردنەسەری سالآنێکی درێـژ هـەبێت لـەنێو کتێبخانەکانـدا، بـەلآم خـۆ فەلسەفه تەنها بەرهەمێکی نێو کتێبخانەکان نییه، بەڵکو پێش هـەموو شتێك ئەنگێزەیەکی کەینونی و ئەخلاقییه که له منداڵییەوه له ناخماندا لەدایك دەبێت و پێویست دەکات له قۆناغێکی تردا بیگوێزینەوه نێو دەق و له کتێبخانەکاندا پەروەردەی بکەین. واته نابێت کتێبخانەکان بمانکەنـه مرۆڤه ئەکادیمی و خەمسارد و کامڵەکان، بەڵکو دەبێت بمانگەڕێننەوه بۆ قۆنـاغی بـەر لـه قبـووڵکردنی یاسـا پێشـوەختەکان. کتێبخانـەکان نامانگەیەننه فەلسەفه، بەڵکو به پێچەوانەوه دەبێت ئەنگێزه فەلسەفییه ساناکانی ناخی خۆمان ڕاپێچی کتێبخانەکانمان بکـەن و لـەوێوه پرسـەی تەرجەمەکردنی پرسیاره (مرۆییه، سەدییه، زەینییـەکان)، بـۆ پرسـیاره (مرۆییه، سەدییه، زەینییەکان)، بۆ پرسیاره بابەتییه نووسراوەکانی نێو دەق دەست پێ بکات.

له خۆڕاش نییه ئێستا ژمارەیەك له فەیلەسـووفه گـەورەکانی دنیـای هاوچەرخ، داوای ئەوه دەکەن که فەلسـەفه نـەك هـەر ببێتـه وانەیـەکی خوێندنی ئامادەیی و زانکـۆیی، بـەڵکو ببێتـه وانەیـەکی سـەرەکی لـه

خوێندنی سەرەتاییدا، بەڵام بەجۆرێك بوترێتەوە لەگەڵ فەنتازیا و توانای وەرگرتنی منداڵدا بگونجێت. بۆیە ئەگەر لەچاوکردنی چاویلکەی قۆناغی منداڵی بۆ تەماشاکردنی دنیا و دیاردەکان جۆرە خولیایەکی فەلسەفی بەرهەم بێنێت، ئەوا ئەو سەرچاوانەی تۆ باستکردن سەبارەت بە فەلسەفاندن هەموویان هەمان مانا دەگەیەنن، بەڵام بە تەعبیری جیاواز. تێڕامان بەرامبەر دنیا چییە جگە لە کردەیەکی منداڵی؟! بەهەمان شێوە سەرسامبوون و گومانکردن و هەستکردن بە دەستەوسانی و لاوازی لە ئاست دیاردەکانی دنیادا، هەموویان گۆشەنیگا جیاوازەکانی جیهانبینی منداڵن بەرامبەر دەوروبەر.

**شوان ئەحمەد: لەمڕۆدا کە زانست بە ئەوجی پێشکەوتنی خۆی گەیشتووە و تەکنەلۆژیا و سیستەمەکانی پەیوەندی کۆنترۆڵی تەواوی دنیایان کردووە، دەبێت پێداویستی فەلسەفە و بیرکردنەوەی فەلسەفی چی بێت و چ گرنگییەکی هەبێت؟**

**د.شاهۆسەعید:** سەرەتا حەزدەکەم بڵێم زانست نەگەیشتووەتە ئەوجی پێشکەوتنی خۆی، بەڵکو تەنها لە قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەکردندایە. زانستی ئەمڕۆ بە بەراورد لەگەڵ زانستی دوێنێ و زانستی سەدەیەك لەمەوبەر، پێشکەوتووە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ئەو سەدە و ساڵانەی کە دێن، ڕەنگە و زۆر لەوە پاشکەوتووتر بێت کە ئێمە وێنای دەکەین. مرۆڤ هەمیشە و لە هەموو قۆناغێکی وەرچەرخانی مێژووییدا،

تووشی غرووری دوا قۆناغی پێشکەوتن دەبێت و وا تێدەگات گەیشتووەتە ئەوجی کەمال.

لە سەردەمی هیلینیستیدا (واتە لە سەدەکانی پێش زایندا)، دوای مەرگی "ئەرستۆ" چەند زانایەکی بواری ماتماتیك و فیزیا و گەردووناسی وەك: "ئاکلیدس، ئەپۆلۆنیۆس، ئارکەمێدس و ئەرلیستارکۆس"، سەریانهەڵدا و بەجیا لە ئەندێشەی مۆراڵی و سیاسی و میتافیزیکی چەند یاسایەکی زانستی پەتییان کەشفکرد، ئەوەش خۆی لە خۆیدا چرکەیەکی گرنگی گەشەی فیکری زانستی بوو لەو سەردەمەدا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زەنگی کۆتایی سەردەمێکی زێڕین بوو لە فیکری مرۆییدا بە گشتی، چونکە مرۆڤ هەمیشە کائینێکی خاوەن فیکری زانستی نییە، بەڵکو کائینێکی مۆراڵی و میتافیزیکی و ئیستاتیکی و سیاسیشە. ئەوەبوو دەرکەوتنی تاقە ڕەهەندێکی مەعریفە لەو سەردەمەدا (کە مەعریفەیەکی زانستی پەتی بوو)، یەکێك بوو لە هۆکارەکانی باڵادەستی بەها نێگەتیڤەکان، وەك جەبرگەرایی و دۆڕانی ئیرادەی سیاسی و مۆراڵی. دواتریس ڕێی خۆشکرد لەبەردەم بەهێزبوونی ئیمپراتۆرییەتی میلیتاریی ڕۆمانی و خامۆشبوونی نموونەی شاری گریکی.

بە هەمان شێوە لە سەرەتاکانی چاخی مۆدێرندا، کاتێ چەند پێشکەوتنێکی گرنگ لە بواری فیزیای میکانیکی و گەردووناسیدا هاتەکایەوە، "فرانسیس بیکۆن" موژدەی دەستپێکردنی سەدەی زانست و باڵادەستی مرۆڤی مۆدێرنی بەسەر جیهانی سروشتیدا ڕاگەیاند، بەڵام ئەو

موژدەیە هاوزەمان بوو لەگەڵ نیگەرانییەکی کەینونی قوڵدا، چونکە ڕاستە بەجۆرێك لە جۆرەکان مرۆڤی لە غەیبانییەتی سەدەکانی ناوەڕاست دەربازکرد و متمانەیەکی دڵنەواکەری سەبارەت بە بەرهەمەکانی ئەقڵ پێ بەخشی، بەڵام لە هەمان کاتدا تووشی وەهمێکی ساختەی کرد، بەوەی کە زەوی ڕووبەرێکی سنووورداری هەیە و مرۆڤ دەتوانێت بە کەشتی تەی بکات و ئەمپەڕ و ئەوپەڕی گۆی زەوی بکات. هەروەها بەوەی کە چیتر مرۆڤ دەتوانێت لەبری ئەوەی کۆیلەی سروشت بێت، ببێتە سەرداری سروشت.

بەڵام ئایا ئەو وەهمەی زادەی زانستی سروشتناسی ئەو سەردەمە بوو، هاوکات نەبوو لەگەڵ ئەو قەلەقەی کە مرۆڤی بێدارکردەوە و پێی وت: (ڕاستە تۆ دەتوانیت ببیتە سەرداری ئەم زەوییە پان و پۆڕە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەم زەوییە پانوپۆڕەی تۆ شتێك نییە جگە لە گەردێکی زۆر زۆر بچووك لە گەردوونێکی بێکۆتا و فەزایەکی نەبڕاوەدا). بەمجۆرە مەعریفەی زانستی لەگەڵ کردنەوەی هەر ئەڵقەیەکدا، خۆی لە ئەڵقەیەکی زۆر گەورەتر و فراوانتردا دەدۆزێتەوە.

حەزدەکەم جارێکی تر بڵێم: ئەمڕۆ زانست نەك هەر بەو ئەوجی پێشکەوتنی خۆی نەگەیشتووە، بەڵکو بە ئەوجی ڕێژەگەرایی خۆی گەیشتووە، چونکە هەرەکو پێشتر باسمانکرد زانست کارکردن نییە لە بازنەی حەقیقەتەکاندا، بەڵکو کارکردنە لە بازنەی گریمانەکاندا، هەموو گریمانەیەکیش بەرەو گریمانەیەکی ترمان دەبات... بۆیە ڕەنگە میتودی (زانستی- ماتماتیکی) تا ئێستا باڵاترین میتۆدی ئەقڵی- پەتی بێت،

بەڵام ئەو میتۆدە هەر هێندە پارێزگاری لە تایبەتمەندیی خۆی دەکات کە لە جیهانی هێمای زەینییەوە دەچێتە جیهانی ئەزموون، ئەوکات لە جیهانی حەقیقەتە زەینییە بێگوناهەکانەوە دەپەڕێتەوە بۆ جیهانی ئەو گریمانانەی کە خۆمان دروستمانکردوون. واتە زانست تەنها لە ئاستە میتۆدییە تیۆرییەکەیدا سانسۆری ئەقڵی ئێمە دەکات، لەوە بەدواوە خودی مرۆڤ گریمانەکانی خۆی پێ ساغ دەکاتەوە...

هەر دوور مەڕۆ تیۆری "داروین" لە بایەلۆجیادا و تێزە بەناوبانگەکەی دەربارەی (مانەوەی بۆ بەهێزترین)، لەلایەکەوە پشتئەستوور بوو بە ئەنجامگیرییەکی زانستی پەتی کە وەك ڕاگەیاندنی شۆڕشێکی زانستی وابوو، بەڵام لەلایەکی ترەوە کارکردن بوو لە بازنەی گریمانەیەکی ئابووریدا کە "مالتۆس" پێشکەشی کردبوو. مرۆڤەکان بە زنجیرەیەکی ئەندازەیی ١، ٢، ٤، ٨... زیاد دەکەن، بەڵام شمەك و خۆراك و پێداویستییەکان بە زنجیرەیەکی ژمارەیەکی ١، ٢، ٣، ٤... زیاد دەکەن. "داروین" لەسەر بنەمای ئەو گریمانەیەی "مالتۆس" کە ئەڵبەتە دەرکەوت ڕاست نییە، گریمانە بایەلۆجییەکەی خۆی دامەزراند. بەوەی ئەو دۆخە ئابوورییە دواجار دەبێتە هۆی پێکدادانی ئینسانەکان و مانەوەش بۆ ئینسانە بەهێزو چالاکەکان دەبێت و و کەمینە دەسەڵات دەگرێت بەسەر زۆرینەدا. هەروەها ئەو دوو تێزە ئابووری و بایەلۆجییە، هاوزەمان بوون لەگەڵ گوتاری ئیگۆسەنتەریزم و بەکۆیلەکردنی سروشت لەلایەن مرۆڤی خۆرئاواییەوە...

لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە بڵێین کە هەموو بانگەشەیەك بۆ پێشکەوتنی زانست، غایەتێکی نازانستی مەبەستگەرای لە پشتەوەیە، چونکە گرنگیی زانست لە میتۆدەکەیدایە نەك گریمانەکانی لەسەر ئەرزی واقیع. واتە لە شێوازی لێکۆڵینەوەکەیدایە نەك ئامانجی لێکۆڵینەوەکە. کاتێکیش لە زانستدا میتۆد لە گریمانە لە پێشتر و شێواز لە ئامانج گرنگترە، ئیدی ئێمە ناتوانین جیاوازی لەنێوان زانست و فەلسەفەدا بکەین، چونکە هەردووکیان میتۆد پەیڕەو دەکەن، بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە زانست- بێجگە لە ماتماتیك-، گریمانە هەستپێکراوەکان ئەزموون دەکات و فەلسەفەش گریمانە زەینییەکان دەکاتە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکانی خۆی. واتە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی فەلسەفە لە گریمانەی زەینیدا تووشی هەڵە دەبێت، زانستیش لە گریمانە مادییەکاندا تووشی هەڵە دەبێت.

ئەڵبەتە دەبێت ئێمە جیاوازی لەنێوان دوو ئاستی زانست و فەلسەفەدا بکەین، چونکە هەردووکیان لە ئاستێکدا لەیەك دەترازێن و لە ئاستێکی تریشدا هێندە لە یەکتر نزیك دەکەونەوە کە جیاکردنەوەیان لە یەکدی گرانە. پێشتر وتمان ڕۆحی هەندێ لە فەیلەسوفەکان زیاتر لە ڕۆحی زانا و هەندێکیشیان زیاتر لە ڕۆحی شاعیرەکانەوە نزیکن. بە هەمان شێوە بە دیدێکی تردا دەکرێت بڵێین گوتاری زانستی هەندێ جار لە گوتاری خاوەن کۆمپانیا و جەنەڕاڵەکانەوە نزیکە، هەندێ جاریش لە گوتاری فەیلەسوف و شاعیرەکان دەچێت... بەڵام لە ڕاستیدا کاتێك زانست دەگاتە ئەوجی خۆی کە بەدوای فەلسەفەی خۆیدا دەگەڕێت، واتە جگە لە

بەرژەوەندییـــەکانی لەســـەر زەوی بـــەدوای لۆجیکێکـــدا دەگـــەڕێت کـــە بیفەلسەفێنیّ و مانایەکی باڵاتری لە پێداویستییە ڕۆژانەییەکانی مرۆڤی پیّ ببەخشێت... هەربۆیە ماتماتیك کە دایکی هەموو زانستە سروشــتی و پەتییەکانــە، دواجــار مــرۆڤ لــە گەڕیدەیــەکی فیزیکییــەوە دەکــات بــە گەڕیدەیەکی میتافیزیکی، بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ لە وێلگاکانی ماتماتیکدا ون نەبێت، هەمیشە پێویستی بە لۆجیکێــك هەیــە کــە دواجــار دەبیــنین هەمان لۆجیکی فەلسەفییە.

بۆیە هەموو قوڵبوونەوەیەك لە فەلسەفەدا، دەمانگەیەنێتە ماتماتیــك و هەموو قوڵبوونەوەیەکیش لە ماتماتیکدا دەمانگەیەنێتەوە فەلسەفە. بە بڕوای من ناکرێت لە زانست و فەلسەفەدا باس لــە گەیشــتن بــە لوتکــە بکەین، چونکە ئەوکاتەی فەیلەسوف دەگاتــە لوتکــە چــیتر فەیلەســوف نییە، بــەڵکو ماتمایکیســتە وەك "دیکــارت و کانــت". ئەوکاتــەش زانــا دەگاتــە لوتکــە چــیتر زانــا نییــە، بــەڵکو فەیلەســوفە وەك "نیــوتن و ئەنشتاین".

**شــوان ئەحمــەد: کەواتــە مــرۆڤ ســەرباری پێشــکەوتنی زانســت و تەکنەلۆژیا، ناتوانێت دەستبەرداری فەلسەفە ببێت؟**

**شاهۆ سەعید:** هەرگیز فەلسەفە و زانســت نەبوونەتــە ئاڵتــەرناتیڤی یەکترو ناشبن... لە ڕاستیدا ئەو کەسەی ئیــدعای زانســتخوازی دەکــات و دەڵێت مادامەکی ئێمە زانستمان هەیە پێویــستمان بــە فەلســەفە نییــە، هەروەکو ئەو ئاینخوازە سەلەفییە وایە کە پێــی وایــە مادامــەکیّ ئێمــە

کتێبی یەزدانمان هەیە، ئیتر با هەموو کتێبەکانی مرۆڤ بسووتێنین، چونکە زانست و فەلسەفە لە بنەڕەتدا، دوو وەزیفەی جیاوازیان هەیە. ڕاستە هەندێ جار دەچنە پەیوەندییەکی دیالێکتیکییەوە و تەواوکەری یەکترن، بەلام پەیوەندیی دیالێکتیکی نێوان شتەکان حەقیقەتی لە یەکچوونیان ناگەیەنێت و نایانکاتە ئالتەرناتیڤی یەکتر، بەلکو بەپێچەوانەوە حەقیقەتی جیاواز و لە یەکنەچوونیان دەسەلمێنێت. وەك پەیوەندیی دیالێکتیکی نێوان ڕۆژ و شەو کە لە ماهییەتدا دژی یەکترین، بەلام بەبێ یەکیش هیچ مانایەکیان نییە.

زانست هەمیشە حەز بە پارچە پارچەکردنی بوون دەکات، لەپێناو دیراسەکردنی و چڕکردنەوەی سەرنجەکانی لەسەر پنتێکی دیاریکراو، بەلام فەلسەفە هەمیشە دەخوازێت شێوەیەك لە هارمۆنی لەنێوان شتە دژ و وەزیفە جیاوازەکاندا بدۆزێتەوە. هەر بۆیە "سبنسەر" لە پێناسەی فەلسەفەدا دەلێت: (فەلسەفە مەعریفەیە، بەلام مەعریفەیەك کە ڕەگەز و پێکهاتەکانی لە دۆخێکی تەواوی هارمۆنی و ئایوێزانبووندایە). لێرەوە فەلسەفە هەندێ جار بریتییە لە مۆرك بەخشینی گشتی بە شتەکان، وەك دیدی فەلسەفی مرۆڤ بەرامبەر (ژیان و مەرگ، ڕاستی و درۆ، جوانی و ناشرینی، بەرژەوەندی و قوربانیدان، ئازادی و ئیلتزام و زانین و نەزانین و... هتد). هەندێ جاریش بە پێچەوانەوە بریتییە لە چڕکردنەوەی یاساو دید و پرەنسیپە گشتییەکان، لە یاسا و دیدی ورد و دیاریکراودا. بۆیە دەبیستین دەوترێت: (فەلسەفەی زانست، فەلسەفەی مێژوو، فەلسەفەی یاسا، فەلسەفەی فیزیا و فەلسەفەی زمان و... هتد). واتە فەلسەفە لە دۆخی

یەکەمدا ئەنگێزەیەکی میتافیکری لە پیشتەوەیە و ڕازی نییە بەوەی کە هەیە، لە دۆخی دووەمیشدا ئەنگێزەیەکی زانستی- بابەتی لە پشتەوەیە و دەیەوێت ئەوە بفەلسەفێنێت کە هەیە. هەروەها دەکرێت بڵێین زانست ئیشکردنە لە دنیای شتە بەرجەستەکاندا، بەلاّم فەلسەفە بریتییە لە کارکردن لە دنیای وێنە و ئایدیا زەینییەکاندا. هەر ئەمەشە وا لە فەلسەفە دەکات کە بە دیوێکدا لە بازنەی میتافیزیکدا کاربکات... بۆ نموونە ئەگەر کەرەستەی فیزیا مادە و ڕەهەند و دۆخە جیاوازەکانی مادە بێت، ئەگەر کەرەستەی ماتماتیك ژمارە و گریمانە و هاوکێشە بیرکارییەکان بێت، ئەوا کەرەستەی فەلسەفە خودی فیکرە، واتە بیرکردنەوە لەناو بازنەی فیکردا، دەربارەی فیکر و شتە پەیوەندیدارەکان بە فیکرەوە.

بەلاّم "کۆرنۆ" کە زانایەکی فیزیکییە و لە سەدەی نۆزدەدا ژیاوە، جیاوازی لەنێوان فەلسەفەو زانست دەکات بەوەی فەلسەفە هەڵسەنگاندنی ورد و ڕەخنەییانەی بەرهەمی زانستەکانی ترە. زانست هەمیشە ئەو چارەسەرانەمان پێشکەش دەکات کە دڵنیاییمان پێدەبەخشێت، بەلاّم فەلسەفە بە پێچەوانەوە هەوڵدەدا هەمیشە لە بازنەی ئەو کێشە و گرفتانەدا بمێنێتەوە کە سەرەڕای گۆڕانکاری لە فۆرمەکانیاندا، لە گەوهەردا وەك خۆیان دەمێننەوە. لێرەوە هەرچەندە فەلسەفە هەندێ جار لە خانەی نەیاری زانستدا دەردەکەوێت، بەلاّم سەرەنجام دەچێتەوە خزمەتی زانست، چونکە هەمیشە هانی دەدا کە لە

ئاستێکی دیاریکراودا گیر نەخوا و بەگومانەوە تەماشای بەرهەمەکانی ڕابردووی خۆی بکات.

پێشکەوتن و دینامیەتی زانستیش هەروەکو فەلسەفە، بەندە بە خولیای پرسیارکردن و تێڕامان و سەرسامبوونەوە بەرامبەر گەردوون. ئەگەر خوێندکارێکی زانست بەرامبەر دنیا سەراسیمە نەبێت، ئەوا لە باشترین حاڵەتدا دەبێتە دەرخێکی باشی یاسا زانستییەکان و وەك چەند ڕێسایەکی کۆنکرێتی تەماشای زانستەکەی خۆی دەکات. لەکاتێکدا ترسناکترین چرکەی زانست هەروەکو فیکر و ئایدیۆلۆجیا چرکەساتی دۆگمابوونە، چونکە زانست بە وەهمدا دەچێ گەر وابزانێت ئەو یاسایانەی بەرهەمی هێناون، یاسای کۆنکرێتین و قابیلی گومانلێکردن نین... "نیوتن" تەنها کاتێك یاسای کێشکردنی زەوی دۆزییەوە کە بە چاوی منداڵ نەك بە چاوی زانا تەماشای کەوتنەخوارەوەی سێوێکی کرد، هەروەکو فەیلەسوفێکیش گومانی لە هەموو ئەو یاسا فیزیکییانە کرد لە سەردەمی ئەودا باوبوون... بە هەمان شێوە "ئەنیشتاین" وەك زاناکانی سەردەمی خۆی، لە پشتی مێز و لەناو تاقیگاکاندا تیۆری ڕێژەگەریی کەشف نەکرد، بەڵکو لە ڕێگای خەیاڵدانێکی شاعیرانەوە بەشێکی زۆری یاساکانی وێناکرد. ئەو گومانی لە ڕەهایی هەموو ئەو یاسایانە کرد کە لەناو تاقیگاکان و لەسەر ئەرزی واقیع ئەزموون دەکران، ئەمەش باڵاترین لوتکەی بەیەکگەیشتنی زانست و فەلسەفەیە.

لە پۆلێنکارییەکی دیکەی نێوان فەلسەفە و کایەکانی تردا دەکرێت بڵێین: (زانستە مێژووییەکان لەو شتانە دەکۆڵنەوە کە گۆڕانکارییان

بەسەردا هاتووە و هەرگیز دووبارە نابنەوە و ناگەڕێنەوە، مەرجی زانستە سروشتییەکانە لەو شتانە دەکۆڵنەوە کە لە دۆخێکی جێگیردان و یاسا نەگۆڕەکان جڵەویان دەکات)، بەڵام فەلسەفە لە نێوان ئەم دوو جۆرە زانستەدا دەخوازێت لە چەمکی بەها بکۆڵێتەوە کە لە شوێن و کاتێکی دیاریکراودا گیر ناخوات. لە ڕێگای زانستی لۆجیکەوە لە بەهای جوانی بەرامبەر ناشرینی دەکۆڵێتەوە. لە ڕێگای ئاکارناسی (مۆراڵ)ەوە لە بەهای خێر بەرامبەر شەڕ دەکۆڵێتەوە. لە ڕێگای میتافیزیك و فەلسەفەی ئاینیشەوە لە بەهای پیرۆز بەرامبەر بەهای ئاسایی دەکۆڵێتەوە. دواتریش دەخوازێ هارمۆنییەك لەنێوان سەرچاوەکانی ئەو بەهایانە سازبدات، بەتایبەتی سێکوچکەی (ڕاستی- جوانی- خێر) بەرامبەر (هەڵە- ناشیرینی- شەڕ).

بەڵام ڕەنگە "بێرتراند ڕاسل" کە لەیەك کاتدا- فەیلەسوفێکی گەورەو زانایەکی گەورەشە- گرنگترین خاڵی پەیوەندی نێوان فەلسەفە و زانستی دیاریکردبێت، کاتێك دەڵێت: (فەلسەفە وەك زانستەکانی تر بەدوای چنگکەوتنی ڕاستیدا ناگەڕێت، بەڵکو بەدوای ئەو بابەتانەدا دەگەڕێت کە هێشتا نەبوونەتە ڕاستی و بەڵگەنەویست). بە مانایەکی تر ئەو بابەتانە کە دوا وەڵامان دەربارەیان هەیە دەچنە خانەی زانستەوە، بەڵام ئەو کێشانەی گومانمان تێدا دەورووژێنن و پرسیارمان لا دروست دەکەن و لە دۆخێکی ناجێگیردان کێشەی فەلسەفین.

بەهای فەلسەفە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە خاوەنی هیچ وەڵامێکی یەقینی نییە، ئەو مرۆڤانەی شانسی ئەوەیان نەبووە حەز لە فەلسەفە

بکەن یان شارەزاییەکیان لە بابەتە فەلسەفییەکاندا هەبێت، هەمیشە دیلی حوکمە باو و پێشوەختەکانن، یان دیلی نێو بازنەی ئەو بیرۆکانەن کە لە کەسێکی ترەوە بۆیان گوازراوەتەوە و خۆیان هیچ دەستێکیان لە خەملاندنیدا نەبووە.

"جان بیاجێ"ش کە لە یەك کاتدا فەیلەسوف و زانایەکی گەورەیە، بەراوردێکی جوان لەنێوان زانست و فەلسەفەدا دەکات و دەڵێت: (هەندێ کێشە و بابەت هەن کە لە زانستدا بایەخێکی تەوتۆیان نییە، بەلام لە فەلسەفەدا بایەخی زۆر گرنگیان هەیە و کێشەی ڕەوان). بۆ نموونە لە زانستدا قسەکردن دەربارەی غایەتی بوون هیچ بایەخێکی نییە و دەچێتە خانەی میتافیزیکەوە، بەلام دواجار هەموو بەها مرۆییەکان وەك خۆشەویستی و قوربانیدان و خەبات و هاوڕێیەتی و... هتد. زادەی کێشەی غائیەتی وجودن. بۆ نموونە کاتێك ئێمە دەڵێین فلانە ڕەفتار ئەخلاقییە و فلانە کردار نائەخلاقییە (پێبزانین یان نا)، ئێمە قسە لە پەیامێکی پێشوەخت دەکەین کە دەبێت مرۆڤ لە ژیاندا جێبەجێی بکات، واتە قسە لە غایەتێك دەکەین کە بزوێنەری بوون و ژیانی مرۆڤە.

جیاوازییەکی تری نێوان زانست و فەلسەفە، پێوەندیی بە جیاوازی وەزیفە و خواستی مەعریفی نێوانیانەوە هەیە. خواستی مەعریفی زانست خواستێکە بەرەو کەشفکردن و دۆزینەوەی نهێنی یاساکانی، بەلام خواستی مەعریفی فەلسەفە خواستێکە لەپێناو چەمکاندن و ئەفراندنی ئایدیای تازەدا نەك کەشفکردنیان. هەربۆیە "جیل دۆلۆز" فەلسەفە ناودەنێت دەزگای بەرهەمهێنانی چەمك، یان دەزگای چەمکاندن. دەکرێت

نموونەیەك بێنینەوە و بڵێین: یاسای مەرکەزیەتی خۆر و خولانەوەی هەسارەکان بە دەوری خۆردا، یاسایەك بوو کە زانستی فیزیای گەردوونی لەسەر دەستی "کۆپەر نیکۆس و گالیلۆ" کەشفی کرد. واتە یاسایەك بوو پێش ئەوانیش لەئارادا بوو. ئەوان نەیانخولقاند، بەڵکو تەنها پەردەیان لەسەر هەڵماڵی، بەڵام (چەمك) یان (جیهانبینی فەلسەفی) یاسایەك نییە کە لە دەرەوەی ئەقڵی مرۆڤ بوونی هەبێت، بەڵکو بەرهەمی خودی ئەقڵە و خۆی دروستی دەکات و پەرەی پێدەدات. دواتریش بەجۆرێك بوونی دەسەلمێنێت کە داخڵی هاوکێشە سروشتییەکان دەبێت، وەك ئەوەی بوونێکی فیزیکی هەبێت.

"دۆلۆز" لە بەشێکی کتێبی (ئایا فەلسەفە چییە؟)، باس لەو وەزیفەیەی فەلسەفە دەکات و دەڵێت: (فەلسەفە چەمکەکان لە سەدیمەوە- واتە لە دۆخێکی نەخەملیوەوە-، دەگوێزێتەوە بۆ دۆخێکی خەملیو لە دەماغدا). ئەڵبەتە ئەوە گرنگترین ئەرکی فەلسەفەیە، چونکە ئێمە هەمیشە هەوڵدەدەین خۆمان لە بوون بە سەدیم بپارێزین. ڕەنگە وەکو جەستە ئێستا ئێمە لە دۆخێکی سەدیمیدا نەبین، بەڵام زۆرجار ئەفکارەکان لە مێشکماندا ختورە دەکەن و ناتوانین بیانگرین و بیانخەینە بازنەی چەمکەکانەوە، یان لەبیرمان دەچنەوە یان تێکەڵاوی ئەفکاری تر دەبن. بۆیە یەکێك لە ئەرکەکانی فەلسەفە لەوێوە دەست پێدەکات کە ڕێگە نادات ئەو ئەفکارانەی لە مێشکماندا ختورە دەکەن، بڕەوێنەوە و بچنەوە حاڵەتی سەدیمی، ئەگەرنا چەمکی تازە و بەهای تازە ئیدی لەدایك نابن و لە دۆخی سەدیمی بەردەوامدا دەبن. چەمك و بەها کۆنەکانیش

بەجۆرێك دەبنە بەها و چەمكی كۆنكرێتی كە مامەڵەی مادییان لەگەڵدا دەكرێت، وەك چۆن فیزیا مامەڵە لەگەڵ بەرددا دەكات. ئەمەش گرنگترین و سەرەكیترین جیاوازی نێوان وەزیفەی فەلسەفە و زانست لەلایەك و جیاوازی نێوان كەرەستە و مادەی خاوی لێكۆڵینەوەكانیانە لەلایەكی ترەوە.

**شوان ئەحمەد: "ئۆگەست كۆنت" پێیوایە لە قۆناغی پۆزەتڤستیدا فەلسەفە هیچ بابەخێكی ئەوتۆی نامێنێت، بەڵام "بۆخنسكی" لە كێتبەكەیدا (فەلسەفەی هاوچەرخی ئەوروپی) لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستەی "كۆنت"دا دەڵێت: (واقیع ئەوەی بۆ سەلماندین كە فەلسەفە لەبری ئەوەی بەهۆی گەشەكردن و پێشكەوتنی زۆری زانستەوە بەلادا بێت، زیاتر بەگورتر بووە و برەوی پەیداكردووە). لەسەر ئەم مەسەلەیە چی دەڵێن؟**

**شاهۆ سەعید:** "ئۆگەست كۆنت" لە سەردەمێكی خەنجاڵی پڕ لە پێكادان و یەكترسڕینەوەی نێوان كایە و ڕێچكە زانستی و فیكرییەكاندا دەركەوت، سەردەمێك كە تیایدا فەلسەفەی مۆدێرنی سەدەی هەژدە و دواتریش شۆڕشی ١٧٨٩ی فەڕەنسا كۆتاییان بە لاهوتی سەدەكانی ناوەڕاست و هەموو ئەو نەریتە كۆمەڵایەتی و سیاسییانە هێنابوو كە زادەی ئەو لاهوتە بوون. ئەڵبەتە دارمانی بەها كۆمەڵایەتییە كۆنەكان قەیرانێكی سیاسی- كۆمەڵایەتی- ئاینی گەورەی خستبووەوە، بۆشاییەكی دروستكردبوو كە دەبوو پڕبكرێتەوە.، پیاوانی ئاینی و قەشەكان بوو پێیان

وابوو، تەنها چارەسەر بریتییە لە گەڕانەوە بۆ مۆدێلی کۆمەڵگای ڕابردوو، هەرچی فەیلەسوفەکان بوو دیراسەی کۆمەڵگایان دەکرد، نەك وەك ئەوەی کە هەیە، بەڵکو وەك ئەوەی کە پێویستە ببێت. واتە ئەوانیش باسیان لە مۆدێلێکی ئایندەیی کۆمەڵگا دەکرد کە درێژبوونەوەی یۆتۆپیای فەلسەفی بوو. هەرچی زاناکانیش لە بواری پسپۆڕی بەرتەسکی خۆیاندا، سەرقاڵی کاری خۆیان بوون و پێیانوابوو زانست خاوەنی هیچ بەرپرسیارێتییەك نییە لە بەرامبەر کۆمەڵگا، چونکە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا سەر بە فەلسەفە و ئاینە، نەك زانست.

بۆیە "کۆنت" وەك "مارکس" و بەشێکی زۆری بیریارانی سەدەی نۆزدە، هەستی بە نیگەرانییەکی قوڵ کرد بەرامبەر ئەو دۆخی پەرتبوونەی فیکر. ئەو هەمان ئەو دیدە مێژووییەی بەرامبەر فەلسەفە هەبوو کە باسمانکرد، واتە تەماشاکردنی چالاکی فەلسەفی وەك قۆناغێکی مێژوویی وەرچەرخان لە ئەفسانەوە بۆ زانست. وردتر ئەو بڕوای وابوو، مێژووی مرۆڤایەتی بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت: ئەفسانە (دەسەڵاتی خورافە)، میتافیزیك (دەسەڵاتی فەلسەفە)، پۆزەتیفیزم (دەسەڵاتی زانست)، بەڵام دەبێت وریابین لە حوکمدان سەبارەت بە ڕەخنەی "کۆنت" لە فەلسەفە، چونکە ئەو نەیاری فەلسەفە نەبوو وەکو دەزگایەکی بەڵگاندن، بەڵکو نەیاری ڕەوتێکی فەلسەفەی نێگەتیڤیزم بوو کە لەسەر دەستی سۆشیالیستە خەیاڵی و ڕێچکە فەلسەفییە کۆمەڵایەتییەکانی فەرەنسا و فەلسەفەی دیالێکیتکی "هیگڵ" و چەپە هیگڵییەکانی ئەڵمانیا سەریهەڵدابوو.

واته "کۆنت"یش وەك "مارکس"، فەیلەسوفێکی ڕەسەنی سەدەی نۆزدە بوو کە تەواوی پرۆژەکەی بۆ ڕەخنەگرتن لە فەلسەفە تەرخانکردبوو. ئەڵبەتە "کۆنت و مارکس" تەنها لە ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەی سەردەمەکەیاندا لەیەك دەچن، دەنا تەواوی پرۆژەکەیان پێچەوانەی یەکترە. هەرچی "کۆنت" بوو بڕوای وابوو لەبەرئەوەی فەلسەفە واقیعی کۆمەڵایەتی پێ ناگۆڕێت، دەبێت قبوڵی بکات و مامەڵەیەکی زانستی پەتی لەگەڵ پێکهاتە و یاساکانیدا بکات. "مارکس"یش پێیوابوو لەبەرئەوەی فەلسەفە کۆمەڵگای پێ ناگۆڕێت، دەبێت واز لە تەفسیرکردنی بهێنێت و ڕاستەوخۆ دەستبداتە گۆڕینی. ئەویش لە ڕێگای چالاکی کۆمەڵایەتییەوە. نەك چالاکیی فیکری پەتی.

واتە فیکری کۆمەڵایەتی سەدەی نۆزدە بەگشتی لەمسەری ڕاستەوە بۆ ئەوسەری چەپ، لەمسەری پۆزەتیڤیزمی "کۆنت"ەوە بۆ ئەوسەری نیگەتیڤزمی "مارکس"، خاوەنی خولیایەکی زۆر گرنگ بوو کە بریتی بوو لە گواستنەوەی چالاکی فیکری و زانستی بۆ چالاکی کۆمەڵایەتی، بەڵام داخۆ ئەو بیریارانەی کە (واقیع)یان کردبووە تاقە پێوەری زانست و فیکر، خۆیان تا چەندە واقیعی بوون و لەسەر ئەرزی واقیع تا چەندە تیۆرکانیان پراکتیزە کرا؟ سەبارەت بە "کۆنت" کە بڕوای ڕەهای بە دەسەڵاتی زانست و بەرهەمەکانی زانست لە کۆمەڵگادا هەبوو، خۆی یەکێك بوو لەوانەی چەندین سنووری لەبەردەم کرانەوەی زانستدا دانا.

ئەگەر لە چاوی ئەمڕۆی زانستەوە تەماشای بکەین. ئەوا یاساکانی "کۆنت" بۆ زانست جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ یاسا کۆنکرێتییەکانی

کەنیسەدا نەبوو، سەبارەت بە ئازادی فیکری زانستی. لە ڕاستیدا "کۆنت" بڕوای بە فەلسەفەی زانست نەبوو، بەڵکو بڕوای بە ئایدیۆلۆجیای زانست هەبوو- چونکە ئەویش هەروەکو ئەو مەجازەی بەڕێزت بەکارت هێنا-، بڕوای وابوو کە زانستی سەردەمەکەی گەیشتووەتە ئەوجی پێشکەوتن و ئیدی دەبێت ئەو زانستە مومارەسەی جۆرێك لە دەسەڵات بکات، لەبری دەسەڵاتی غەیبیانی کەنیسە و دەسەڵاتی میتنافیزیکی فەلسەفە.

بەجۆرێك زانست تەنها نەبووە دیکتاتۆرێك بەسەر کایە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، بەڵکو بوو بە دیکتاتۆر بەسەر خودی خۆشیەوە و مومارەسەی شێوەیەك لە سانسۆری بەسەر کرانەوەی خەیاڵدانی زانستیشدا کرد. بۆ نموونە لە ماتماتیکدا دژی هەموو ئەو تێزانە بوو کە دوور لە ماتماتیکی تەقلیدی ئەو سەردەمە، باسیان لە هاوکێشەی ئەگەرەکان و گواستنەوەی هاوکێشەکان لە بازنەی هەستپێکراوەکانەوە، بۆ بازنەی ئایدیا پەتییەکان دەکرد و ڕووبەرێکیان لە بازنەی هەستپێکراوەکانەوە بۆ بازنەی ئایدیا پەتییەکان دەکرد و ڕووبەرێکیان بۆ ماتماتیکی گریمانەیی هێشتبووەوە، وەك تێزەکەی "لابلاس" بۆ نموونە... لە گەردوونناسیدا دژی هەموو ئەو تێزانە بوو کە باسیان لە پێکهاتەی فیزیکی تەنە ئاسمانییەکان دەکرد، لە دەرەوەی سنووری کۆمەڵەی خۆر. هەروەها لە بایەلۆژیادا دژی ئەو تیۆرانە بوو کە باسیان لە گەشەی زەمەنی بوونەوەرەکان دەکرد. هەروەك چۆن لە کۆمەڵناسیدا، دژی لێکۆڵینەوە بوو دەربارەی ڕەگوڕیشەی مێژوویی کۆمەڵگاکان.

بەڵام ئەگەر لە دیدی ئەم سەردەمەی ئێستامانەوە بڕوانینە ئەو دیدەی "کۆنت" سەبارەت بە زانست و دەسەلاتی پۆزەتیڤیزمی، ئایا هەست ناکەین ئێمە لەبەردەم یۆتۆپیایەکی زانستی و ئایدیۆلۆجیایەکی بەرتەسکداین؟! چونکە خودی زانستی ئەم سەردەمەی ئێستا زانستێکی ڕێژەگەرییە و چەندین ڕووبەری فراوانی بۆ ئەگەر و گریمانەکان هێشتووەتەوە. تەنانەت لۆجیکی ماتماتیکی ئێستا تا ئاستێکی زۆر لە لۆجیکی میتافیزیکی فەلسەفەوە نزیکە، کاتێ جیهان دابەش دەکات بەسەر گریمانە کارپێکراو و گریمانە کار پێ نەکراوەکاندا. سەبارەت بە گەردوونناسیش، هەموو قوڵبوونەوەیەك لەو زانستەدا زاناکان ناچار دەکات لە تاقیگا و تلسکۆبەکان دووربکەونەوە و لە خەیاڵدانـدا گەشتی گەردوونی بکەن، بەڵام ئایا ئەم داماڵینەی کۆمەڵگا لە هەموو ڕابردووناسی و هەموو ئایندەناسییەك و وەرگرتنی وەك عەینەیەکی کیمیایی، ئەنگێزەیەکی زانستی لە پشتەوەیە یان ئەنگێزەیەکی ئاینی شاراوە و چەپێنراوە؟!

لە ڕاستیدا ئەوە ئاینخوازە سەلەفییەکانن داوا لە مرۆڤ دەکەن، تا خۆی زۆر سەرقاڵ نەکات بەو پرسیار و گومانانەوە کە تووشی سەرسامی بەردەوام و فێری گەڕانی بەردەوامی دەکات، نەك زانست، چونکە زانست چییە جگە لەو ئەنگێزەیەی هەمیشە هانماندەدات کە لە جوغزی کات و شوێنێکی دیاریکراودا گیر نەخۆین و دوای هەموو کەشفێك بەدوای کەشفی تردا بگەڕێین. هەموو زانستێك سەرەتا لە دیدێکی میتافیزیکی و سەرسامییەکی گەورە، بەرامبەر گەردوون و ژیان دەست پێدەکات. زانست

به مانایەك لە ماناکان، واتە چالاکی لەناو (زەمەن)دا نەك چالاکی لەناو (شوێن)دا، وەك "ئۆگەست کۆنت"و هەندێ لە پۆزەتیڤیستەکان لە کۆن و ئێستاشدا تیۆریزەی بۆ دەکەن. واتە مرۆڤ (وەك تەنێکی فیزیکی) عەیینییەکی مادی نییە لە شوێنێکدا یاساکانی پانی و درێژی و قورسی بەسەردا جێبەجێ بکرێت، بەڵکو ڕۆحێکە لەناو مێژوو و زەماندا جوڵە دەکات. هەر ئەوەشە جیاوازی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ... ئێمە دەکرێت لەگەڵ ئاژەڵدا مامەڵەیەکی (زانستی- بایۆلۆجی) پەتی بکەین، چونکە ئاژەڵ کائینێکە تەنها ئیستجابەی بەرامبەر ڕووداوەکان لەناو شوێندا هەیە، نەك ڕووداوەکان لەناو زەمەندا، بەڵام مرۆڤ لە ڕێگای یادەوەرییەوە توانای هەیە ڕووداوەکانی ئێستا بە ڕابردووەوە ببەستێتەوە و بیر لە ئاییندەش بکاتەوە و پلانی بۆ دابنێت.

واتە مرۆڤ تەنها جەستەیەك نییە کە بەگوێرەی یاساکانی فیزیا و بایۆلۆژیا لە ڕەهەندەکانی بکۆڵینەوە لەناو شوێندا، بەڵکو ڕۆحێکیشە کە لەناو زەمەندا لە دەرەوەی یاسا کۆنکرێتییەکانی شوێنەوە خەون بە ڕەهابوونی زیاتر و ئازادی گەورەترەوە دەبینێت... هەر ئەمەشە وای لە هەندێ فەیلەسوف و زانا کردووە بڵێین مرۆڤ تەنها کائینێکی فیزیکی نییە کە لەناو شوێندا بۆشاییەکی پڕکردبێتەوە، بەڵکو کائینێکی میتافیزیکیشە کە لەناو زەمەندا مێژووی ئەقڵ-یان بە تەعبیرە هیگڵییەکەی دەرکەوتنەکانی ڕۆح-تۆمار دەکات.

مێژووی مرۆڤایەتی مێژووی یادەوەرییە لەناو زەمەندا، نەك مێژووی بوونی فیزیایی لەناو شوێندا. بۆیە هەرگیز ناتوانین یاسا باوەکانی زانست

سەبارەت بە مادە بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگادا جێبەجێ بکەین، چونکە زانست خۆی بریتییە لە چەند گریمانەیەك کە دروستکراوی دەستی خۆیەتی و بریتییە لە ڕستێك گریمانە کە بەپێی گۆڕانکارییەکانی چالاکی مرۆڤ لەناو مێژوودا ئەوانیش دەگۆڕێن و گریمانەی نوێ و نوێتریان لێدەکەوێتەوە، بەڵام مرۆڤی سەدەی نۆزدەیەم کە تازە تووشی شۆکی کەوتنی یۆتۆپیا ئاینییەکان ببوو، بەهەر نرخێك بوو دەیویست یۆتۆپیایەکی ئاڵتەرناتیڤ دروست بکات، کە یۆتۆپیایەکی زانستی بوو.

ئەڵبەتە ئەگەر لە سیاقی مێژووییەوە تەماشای ئەو دۆزە بکەین، ئەوە دەبوو هەر بەو ئاڕاستەیەدا بڕوات، چونکە وەك وتم "ئۆگەست کۆنت" کوڕی ڕەسەنی سەردەمەکەی خۆی بوو، بەڵام لەکاتێکدا ئەو باسی لە پۆزەتیڤیزم و فەلسەفەی قبوڵکردنی دیفاکتۆ دەکرد، خۆی نوێنەرایەتی گەورەترین ڕێچکەی ڕەتکردنەوەی ئایدیۆلۆژی دەکرد بەرامبەر فەلسەفەی دیالێکتیك و سۆشیالیزمی خەیاڵی. واتە ئەو لە واقیعدا بەشێك بوو لە دینامیەتی کۆمەڵگای خۆرئاوای ئەو سەردەمە کە لەژێر کاریگەری جەدەلی فەلسەفیدا بوو، نەك دۆخێکی ستاتیکی کە لەژێر زەڕەبینی وردی زانستدا بێت وەك خۆی تیۆریزەی بۆ دەکرد. واتە ئەو لە سەردەمێکدا بوو کە نەك فەلسەفە دەست لە کارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاند، بەڵکو زانستیش هەوڵیدا کە لەسەر ئاستی تیۆریزەکردن بۆ کۆمەڵگا وەك فەلسەفەیەك خۆی نمایش بکات.

**شوان ئەحمەد: ئایا تەقەلاكانی "ماركس" جۆرە كاركردنێك نەبوو بۆ كۆتاییهێنان بە فەلسەفە، یان هەر هیچ نەبێت بۆ ئەوەی فەلسەفە بكاتە چالاكییەك لە پەراوێزی زانستدا بێت؟**

**د.شاهۆ سەعید:** ئەگەر ئەم پرسیارە گرێ بدەینەوە بە پرسیارەكەی پێشوترەوە، دەكرێت بەراوردێكی سەیر لەنێوان "كۆنت و ماركس"دا بكەین. لەكاتێكدا هەریەكەیان نوێنەرایەتی ڕێچكەیەكی فیكری دەكەن كە لە ڕواڵەتدا بە تەواوی پێچەوانەی یەكترن و لە بەرامبەر یەكدا دوو دژە بارگەی موجەب و سالبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك خاڵی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە. هەردووكیان كوڕی سەدەی نۆزدەن و هەردووكیان لە جەدەلدا، لەگەڵ سۆشیالیزمی خەیاڵی و هیگڵیەتدا پرۆژەی فیكری خۆیان داڕشت. هەردووكیان بەشێوەیەكی سەیر سەراسیمە بوون بەرامبەر زانستی سروشتی و بەرهەمەكانی لەو سەردەمەدا. هەردووكیان دەیانویست لەنێوان زانستی سروشتی و زانستی كۆمەڵگادا، هارمۆنییەك بسازێنن.

لە بەشێكی پرۆژەی فیكری هەردووكیاندا، هێرشێكی گەورە كراوەتە سەر فەلسەفەی ئایدیال و میتافیزیكی باوی ئەو سەردەمە. هەردووكیان لە بەرامبەر داڕمانی بەها كۆمەڵایەتییە لاهوتییەكاندا، بەدوای بەهای ئەڵتەرناتیڤدا دەگەڕێن كە لە زانستەوە سەرچاوە بگرێت. هەردووكیان لە پەرچەكرداریاندا بەرامبەر یۆتۆپیای ئاینی یۆتۆپیایەكی ئایدیۆلۆژییان وێناكرد، وەك دوا فیردەوسی مێژوو (یۆتۆپیای سۆسیۆكراسی) كە حكومەتی زانا و تەكنۆكراتەكانە لای "ماركس". لە ڕێگای ئەم

بەراوردکارییەوە دەردەکەوێت هەرچەندە فیکری زانستی خاوەنی نەقشی گرنگی خۆیەتی لە مێژوودا (بەتایبەتی لە بەرامبەر فیکری لاهوتیدا)، بەلاّم هەلّگری کێشە و یۆتۆپیای خۆشیەتی لە حوکمەکانیدا کە بە بڕوای بەشێکی زۆری (پۆزەتیڤیست و مارکسییەکان)، حوکمگەلێکن حەتمی و یەکلاییکەرەوەن و قابیلی گومان نین، بەلاّم نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە حەتمییەتی فیکری زانستی مارکسی تا ئاستێکی زۆر پشتئەستوورە بە لۆجیکی فەلسەفی، نەك لۆجیکی زانستی پەتی، چونکە "مارکس" لە بابەتی دیالیکتیدا لەژێر کاریگەریی تەواوی "هیگل"دایە. ماتریالیزمی "مارکس" کوڕێکی ڕەسەنی ئایدیالیزمی هیگلّییە. کوڕێك کە خاوەنی هەمان میکانیزمی بیرکردنەوەیە، بەلاّم بە گوتاری جیاواز و سیمبولی جیاوازەوە.

پاشان نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە نەیاریی "مارکس" بۆ فەلسەفە وەك نەیاریی "کۆنت" نەبوو، چونکە ئەو مانیفێستی کۆتایی ڕاگەیاند کە سەرقالّی وردبوونەوە و تێڕامان بوو لە بابەتەکانی ئەودیو سروشت و مەسەلەکانی عیلە و مەعلول و... هتد. بۆیە ناکرێت ئێمە هەر ڕەخنەیەك بەرامبەر ڕێچکەیەکی دیاریکراوی فەلسەفە لە مێژوویەکی دیاریکراودا بە ڕەخنە لە خودی فەلسەفە لە قەلّەم بدەین، چونکە هەموو فەیلەسوفە گەورەکانی جیهان لە ڕێگای ڕەخنەکردنی فەلسەفەی پێش خۆیانەوە دروستبوون.

لێرەوە مارکسیزم و پۆزەتیڤیزم کە لە ڕوالّەتدا وەك دوو ڕێچکەی دژ بە فەلسەفە وێنادەکرێن، خۆیان دوو قوتابخانەی گرنگی فیکری فەلسەفین و

کەم مێژوونووسی فەلسەفە هەیە ئاماژە بە "کۆنت و مارکس" وەك دوو فەیلەسوفی گەورەی مرۆڤایەتی نەدەن. دواتر فەلسەفە بەجۆرێك توانای کرانەوەی بەسەر دەرەوەی خۆیدا هەیە کە هەموو ڕەخنەیەکی لۆجیکی لە فەلسەفە، دواجار خۆی دەبێتەوە بە فەلسەفە.

فەلسەفە نە زانستێکی سنووردارە و نە ئایدیۆلۆجیایەکی ئاراستەکەرە کە یەکێك بتوانێت خۆی بکاتە خاوەنی و بەناوی فەلسەفەوە دۆست کۆبکاتەوە و نەیار بتەرێنێت. فەلسەفە وەك خودی مرۆڤ ئەوکاتە مومارەسەی بالاترین ئاستی خۆی دەکات کە ڕەخنەی خۆی دەکات و لە حالەتی سکوندا گیر ناخوات. واتە جگە لەو ڕەخنانەی کە سەرچاوەکانیان (جەهل، یان بیرتەسکی ئاینی، یان دیکتاتۆرییەت، یان دۆگمابوونی ئایدیۆلۆجییە)، هەموو ڕەخنەیەکی لۆجیکی لە فەلسەفە دەبێتەوە بە فەلسەفە، یان ڕاستتر دەبێتەوە بە دوا قۆناغی گەشەی فەلسەفە. پاشان شەڕی نێوان فیکری (زانستی-سروشتی) و فیکری (لۆجیکی-میتافیزیکی)، شەڕێکی تازە نییە و لە سەدەی نۆزدەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەیلەسوفە سروشتییەکانی گریك و سۆفیستەکان و دواتر ئایدیالیزمی پلاتۆنی و لۆجیکی ئەرستۆیی.

گرنگترین دۆخی فەلسەفە دۆخی ململانێ و جەدەلە نەك بە پێچەوانەوە. تەنانەت هەندێ جار بە لوتکە گەیشتنی فەلسەفە، مەترسیدارترین دۆخی فەلسەفەیە. بۆیە بە بڕوای هەندێ لە مێژوونووسانی فەلسەفە، فەیلەسوفێکی وەك "ئەرستۆ" لە یەك کاتدا گەورەترین فەیلەسوفەکە خزمەتی فەلسەفەی کردووە و خەتەرترین

فەیلەسوفیشە کە گورزی لە فەلسەفە وەشاندووە، چونکە ئەو سیستمێکی فەلسەفیی هێندە پتەوی دارِشت کە دوای مردنی بە هەزار ساڵیش، کەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد تەجاوزی بکات یان رِەخنەی بکات. لێرەوە رِەخنەی "مارکس" لە فەلسەفەی سەردەمی خۆی، چرکەیەکی گرنگی گەشەی فیکری فەلسەفی بووە. چرکەیەکە کە تیایدا فەلسەفە دەکەوێتەوە، کارلێکە و لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا، چونکە ئەو سەردەمە سەردەمی وەرچەرخان بوو، سەردەمی گواستنەوە بوو لە سیستمێکی کولتوورییەوە بۆ سیستمێکی کولتووری تازە.

لەگەڵ دارِمانی هەموو سیستمێکی کولتووریی باو و پێش دروستبوونی هەر سیستمی کولتووری ئاڵتەرناتیڤیشدا، فەلسەفە وەك ئەگەرێکی کولتووری خۆی نمایش دەکات. هەروەکو سەردەمی گریکی-هیلینی کە زێرِینترین سەردەمی یۆنانییەکان و سەردەمی فەلسەفەش بوو، چونکە لەو سەردەمەشدا دەسەڵاتی ئەفسانە کۆتایی پێ هاتبوو، بەڵام هێشتا دەسەڵاتی ئایین دەستی پێ نەکردبوو. بە برِوای من "مارکس" ویستی بەجۆرێك فەلسەفە چالاك بکات کە نەهێڵێ بچێتە ژێر دەسەڵاتی تازە پێگەیشتووی ئەو سەردەمەی زانست بیخاتەگەرِ، چونکە وەك "ئادرنۆ" دەڵێت: (هەرکاتێك فەلسەفە خۆی بدزێتەوە لە ئەرکی خۆنمایشکردن لەناو واقیعدا، ئەوا لەلایەن زانستەوە ئیحتوا دەکرێت). بەو مانایەی کاتێ فەلسەفە بە خراپ نمایش دەکرێت، ئەوا بە خراپیش دەنووسرێت و بیری لێدەکرێتەوە. بۆیە خۆ نمایشکردنی "مارکس" لەناو

مێژوودا بەو شێوە گرنگە، ئەو مانایە دەگەیەنێت کە لەناو فەزای زمان و ڕاڤەکردنیشدا گرنگ خۆی نمایشکردووە.

**شوان ئەحمەد: کەواتە لەبەر ڕۆشنایی قسە بەناوبانگەکەی "مارکس"دا دەکرێت بپرسینەوە، ئایا ئەرکی فەلسەفە گۆڕینی دنیایە یان خوێندنەوە و تەفسیرکردنییەتی؟!**

**د.شاهۆ سەعید:** گومانی تێدا نییە ئەرکی فەلسەفە تەفسیرکردنی دنیا و خوێندنەوەیەتی، بەڵام تەفسیر لەپێناو تەفسیردا نا، بەڵکو لە پێناو دینامییەتی ئەقڵ لەناو مێژوودا. ئەڵبەتە هیچ جوڵەیەکی مێژووییش لە دەرەوەی چالاکی ئەقڵ بوونی نییە، چونکە مێژووی مرۆڤایەتی بریتی نییە لە مێژووی شەڕ و کوشتار و کودەتا و کارەسات و سەرکەوتنەکان، بەڵکو بریتییە لە توانای ئەقڵ لە تەفسیرکردن و خوێندنەوەی ئەو ڕووداوانە.

مێژووی ژیانی بایۆلۆجی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیەدا سەدان ملیۆن ساڵە، بەڵام مێژووی ڕاستەقینەی مرۆڤ وەك کائینێکی بیرکەرەوە و خاوەن ئیرادە کە هەوڵی داوە خۆی بەدەستی خۆی بەشێك لە هاوکێشەکان دەستکاری بکات تەنها چەند ساڵێکە. واتە ئەوکاتە دەستی پێکرد کە مرۆڤ دەستیدایە خوێندنەوە و تەفسیرکردنی دنیا، یان وردتر ئەوکاتەی دەستی پێکرد کە مرۆڤ دەستیدایە خوێندنەوە و تەفسیرکردنی دنیا، یان وردتر ئەوکاتەی کە دەقی زارەکی و دواتر دەقی نووسراو لەدایکبوو. چالاکی "مارکس" یاخی بوو. پاشان وەك "دیریدا" دەڵێت: (کودەتای دژی تەفسیرە باوەکانی ئەو سەردەمەی جیهان بەرپاکرد). واتە مەبەستی

سەرەکی "مارکس" لە گۆڕینی وەزیفەی فەلسەفە لە دووبارەکردنەوەی تەفسیرەکۆنەکانەوە بگۆڕدرێت بە کەشفکردنی تەفسیری نوێ، یان لە تەفسیری میتافیزیکییەوە بگۆڕدرێت بە کەشفکردنی تەفسیری نوێ، یان لە تەفسیری میتافیزیکییەوە بگۆڕدرێت بۆ تەفسیری کۆمەڵایەتی. تەنانەت "دێرێدا" دەڵێت: (مارکس هێندە بێزاربوو بەرامبەر واقیعی ئەو سەردەمەی ئەوروپا نەیدەویست تەفسیری بکات بەو شێوەیەی کە هەیە، بەڵکو بەو شێوەیەی کە وەك تارمایی لەناو زماندا ئامادەیی هەیە).

نووسین ئەو شتانە دروست دەکات کە پێشتر نەبوون و بیریان لێ نەکراوەتەوە. بۆیە "مارکس" لە کتێبی (سەرمایەدا) دەڵێت: (وردبوونەوە بەرامبەر فۆڕمەکانی ژیان لە مێژوودا و دواتر شیکردنەوەی زانستیی ئەو فۆڕمانە، مرۆڤایەتی بە ئاڕاستەیەکدا دەبات کە پێچەوانەی گەشەکردنی واقیعی خۆیەتی). واتە "مارکس" دەیەوێت بڵێت، زمان-نووسین بیرۆکە دەسەپێنێت، چونکە ئەو سەرەتا لەناو بازنەی نووسین و زماندا وردبووەتەوە، نووسینیش ئەو دەرەنجامەی سەپاندووە کە "مارکس" تێزەکەی لە دەرەوەی یاساکانی واقیعی دەرەکی- سەرمایەداری لەسەر داڕشتوە. لێرەوە (تارمایی کۆمۆنیزم) شتێك نییە، جگە لە تارماییەکی زمانەوانی کە "مارکس" هەوڵدەدات لە ڕێگای تەفسیرکردنی دنیاوە بوونی بسەلمێنێت. نەك "مارکس" نەیتوانی لەسەر ئەرزی واقیع گۆشت و ئێسقان ببڕێت بە بەری ئەو تارماییەدا، بەڵکو کۆمۆنیزمی یەکێتیی سۆڤێتیش شتێك نەبوو جگە لە تارماییەکی زمانەوانی هات و وەك خەونێك گوزەری کرد.

"مارکس" شتێکی نەکرد جگە لەوەی لەکاتی تەفسیرکردنی دنیادا، تەسلیمی تارماییەکانی ناو زمانی نووسین بوو. واتە زمان "مارکس"ی نووسیوە، "مارکس"یش هەوڵیداوە مێژووی جیهان بە جۆرێکی تر وەك ڕستە زەینییەکانی ناو زمان بنووسێتەوە. "مارکس" دنیای نەگۆڕی، بەڵکو پێشنیاری وەسوەسەیەکی کرد لەناو مێژوودا. وەسوەسەش خۆی مێژووی هەڵدەبژێرێت و ناخرێتە چوارچێوەی مێژوویەکی تایبەتەوە. وەسوەسە هەمیشە لە سەردەمێکدایە کە سەردەی خۆی نییە، چونکە ئەوکاتەی دەگاتە سەردەمی خۆی لە دۆخی وەسوەسەیی دەردەچێت. لێرەوە "دیریدا" بڕوای وایە "مارکس" هێندەی پەنای بۆ فەنتازیای شانۆیی بردووە کە لە ڕێگای زمانەوە پڕۆسەی دەرهێنانەکەی ئەنجام داوە، هێندە پەنای بۆ ڕەگەزەکانی واقیعی ئەو سەردەمەی ئەورووپا نەبردووە، چونکە واقیعی ئەو سەردەمە خوازیاری ئەوەبوو کە شتەکان لە دۆخی بەرجەستەبووندا بن، نەك دۆخی تارمایی و وەسوەسە.

**شوان ئەحمەد: ئایا ئاقاری (پۆست هیومانیزم)، تەعبیرێکی سروشتی نییە لە خواست و ویستی زانست بۆ قوتاربوون لە فەلسەفە، تەعبیر لەوەی زانست هەوڵی پیادەکردنی دیکتاتۆرییەتی خۆی و باڵادەستی خۆی بەسەر فەلسەفەدا بدات؟**

**شاهۆ سەعید:** بە پێچەوانەوە (پۆست هیومانیزم) تەعبیرێکی مەجازییە بۆ تێپەڕاندنی نموونەی ئەو مرۆڤە مۆدێرنە خاوەن غرروورە زانستییەی کە لە ڕێنیسانس و شۆڕشی پیشەسازییەوە، بەناوی مرۆڤ و

موژدەی سەردەمی زانستەوە (مرۆڤ دەکوژێت و چەکی ئەتۆمی و کیمیایی بەکاردێنێت و ژینگە پیس دەکات و ڕووبەری بیابانەکان فراوانتر دەکات).
بێ هیچ بەرپرسیارێتییەك بەرامبەر نەوەکانی داهاتوو، هەسارەی زەویی کردووەتە تاقیگەیەکی کیمیایی گەورە. ئێمە ئەوە دەزانین کە تەمەنی مرۆڤ لەسەر ئەم هەسارەیە بە سەردەمی وەحشیگەری و چاخەکانی بەردیشەوە سەدان و هەزاران ملیۆن ساڵە، بەلاّم لە دوای چاخی زانست و سەردەمی هیومانیزمی مۆدێرنەوە چیتر لەوە دڵنیانین کە ئایا مرۆڤایەتی سەدەیەکی تر دەگوزەرێنێت یان نا. هەر وەك "گادامێر"یش دەڵێت: (بەهۆی پێشکەوتنی خێرای زانستەوە، ڕەنگە لە ساڵەکانی داهاتوودا شێتەکانیش بتوانن چەکی ئەتۆمی دروست بکەن). ئەڵبەتە زانست بەرپرسیار نییە بەرامبەر ئەو تاوانە گەورانەی بەرامبەر ژیان و ژینگە کراون و ئەگەری ئەو تاوانە گەورانەی بەڕێوەن، بەڵکو ئەو ئاقارە هیومانیستییە مۆدێرنە بەرپرسیارە کە بەناوی پراگماتیزم و زانستگەری و پۆزەتیڤیزمەوە، سەرشانی مرۆڤی لە هەموو بەرپرسیاریەتییەك بەرامبەر ژیان و ژینگە و نەوەکانی داهاتوو سوك کردووە.

گەشەی زانست بەرپرسیار نییە، بەڵکو ئەو دیدە بەرپرسیارە کە بەناوی زانستەوە سوکایەتی بە فەلسەفە دەکات و بەناوی هیومانیزمەوە زانستە مرۆڤایەتییەکانی کردووەتە پاشکۆی زانستە سروشتی و پەتییەکان. ئەڵبەتە لە چەمکی (پۆست هیومانیزم) ناگەین ئەگەر بە مانا بایۆلۆجییەکەی لێکیبدەینەوە، چونکە مەبەست لە تێپەڕاندنی مرۆڤ دروستکردنی کائینێکی تر نییە لە جێگای مرۆڤ، بەڵکو مەبەست

تێپەڕاندنی ئەو نموونەیەی مرۆڤە کە بەبێ ئەوەی کەس ئەو مافەی پێ بەخشیبێت، خۆی کردووەتە سەرداری سروشت و بەبێ هیچ سانسۆرێکی ئەخلاقی دەستکاری سروشت دەکات. لە سەردەمی لاهوتیدا مرۆڤ بڕوای بە یەزدانێکی خاوەن پیرۆزیی ڕەها و مرۆڤێکی کۆیلەی گوناهبار هەبوو، بەڵام لە سەردەمی زانست و هیومانیزمدا مرۆڤ بووە بەجێنشینی یەزدان و بووەتە خاوەن پیرۆزی ڕەها کە سروشتی خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. ئەڵبەتە بە دیوێکدا زانست خزمەتی مرۆڤی کردووە، بەڵام تەنها مرۆڤی ئەم سەردەمە. ئیتر لەوە دڵنیانین کە لە سەردەمەکانی دادێ چەندە خزمەتی مرۆڤ دەکات، چونکە مرۆڤی هیومانیست تەنها لەناو شوێندا خۆپەرست نییە، بەڵکو لەناو زەمەنیشدا خۆپەرستە. واتە تەنها فەزڵی خۆی نادا بەسەر ئاژەڵ و گیانداران و ژینگەدا، بەڵکو فەزڵی ئینسانی ئەم سەردەمە دەدا بەسەر ئینسانی نەوەکانی داهاتوودا.

واتە هەستنەکردنی مرۆڤی ئەم سەردەمە بە لێپرسراوێتی، وەك نامەسئولیەتی ئەو کەسە وایە کە دەچێتە سەر کانییەك و دوای ئەوەی خۆی ئاوی لێدەخواتەوە ژەهری تێدەکات و بەجێی دێڵێت. یان وەك ئەو کەسە وایە کە دوای ئاهەنگگێڕان و مەستبوون و لەوەڕین، پیسی و پاشەڕۆك و شەخەڵ بۆ ئاهەنگگێڕەکانی دوای خۆی بەجێدێڵێت. واتە مرۆڤ زۆر گێلە ئەگەر وابزانێت زانست ئەو مافەی پێداوە ببێتە سەردار و بکوژ و بڕی سەر ئەم زەوییە. ئەمە جگە لە غرورێکی ساختە هیچی تر نییە، چونکە لە کاتێکی وادا زانست دەبێتە ئاراستەکەری مرۆڤ نەك بە پێچەوانەوە. لەکاتێکدا دەبێت هەمیشە زانست سانسۆر بکرێت، چونکە

زانست ئامێرێکی کوێره (تیغێکی دوو دەمه)، دەکرێت خزمەتی خۆمانی پێ بکەین و دەشکرێت خۆمانی پێ بکوژین.

لە دۆخێکی وادا وەك "هابرماس" دەڵێت: (زانست دەبێتە شێوە ئاینێکی تازە و مرۆڤ دەبێتەوە کۆیلە، لەبری ئەوەی تەکنەلۆجیا بچێتە خزمەتی مرۆڤەوە، مرۆڤ دەچێتە خزمەتی تەکنەلۆجیاوە). ئەڵبەتە لەنێوان هیومانیزمی مۆدێرن و پۆزەتیڤیزمی زانستیدا شێوە پەیمانێك هەیە، چونکە یەکەمیان باوەڕی ڕەهای بە مرۆڤ هەیە وەك کائینێکی خاوەن ئەقڵ، دووەمیشیان باوەڕی بە گرنگترن بەرهەمی ئەقڵی مرۆڤی مۆدێرن هەیە کە زانستە. واتە خولیای مرۆڤی هیومانیست لە ناسینەوە بووە بە کەشفکردن، بە مانایەکی تر لە تیۆری مەعریفەوە بوە بە تیۆری زانست. لەم ناوەدا قوربانیی یەکەم ئەنگێزە ئەخلاقی و فەلسەفییەکانە کە ناتوانین لە تاقیگەکانی زانستدا ساغیان بکەینەوە.

بەم جۆرە زانستی سروشتی و پەتی بووەتە پێوەری زانستە کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و مرۆییەکان و خۆی وەك هێزێکی بێلایەن نیشاندەدا، لەکاتێکدا هێزێکی بێلایەن نییە، بەڵکو هێزێکی پاوانکارە و لە سەرانسەری دنیادا لەگەڵ نوخبە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینییە دەسەڵاتدارەکاندا تەماهی دەکات. واتە ئەگەر شانبەشانی پێشکەوتنی زانست فەلسەفە و زانستەکانی تایبەت بە مرۆڤ و کۆمەڵگا گەشە نەکەن، ئەوا زانست لە خزمەتکاری مرۆڤەوە دەبێتە سەرداری مرۆڤ. ئەم بە کۆیلەکردنەی مرۆڤیش بەناوی پێشکەوتنی ئەقڵی مرۆڤەوە پێڕەو دەکرێت. واتە (پۆست هیومانیزم) تەعبیرێکە بۆ دژایەتیکردنی ئەو

هیومانیزمەی چاخی زانست. ڕێچکەیەکی پۆست مۆدێرنیستە بە مرۆڤ دەڵێت تۆ بۆت نییە بەناوی ئاژەڵ و درەخت و کائینەکانی سەرزەمینەوە، بڕیاری چارەنووسی ئەم هەسارەیە بدەیت. بە مرۆڤ دەڵێت ڕزگاربوونی تۆ لە کۆیلایەتی سروشت و هێزە غەیبانییەکان، مانای ئەوە ناگەیەنێت کە خۆت ببیتە سەرداری سروشت و ئاڵتەرناتیڤی یەزدان.

ڕاستە مرۆڤی مۆدێرن توانیویەتی هاوکێشەی نێوان دوالیزمەکانی (سەردار و کۆیلە، پیرۆز و نەفرەتلێکراو، ماتریالیزم و ئایدیالیزم، کاریزماو مێگەل...) تێکبشکێنێت، بەڵام نەیتوانیوە خودی دوالیزمەکان تێکبشکێنێت. واتە ئەو گەمەکانی لە بنەوە هەڵنەتەکاندووە، بەڵکو تەنها کارەکتەرەکانی گۆڕیوە. بۆ نموونە کودەتای مرۆڤ دژی یەزدان (وەك هێزێکی غەیبی خاوەن دەسەڵاتی یەکلاییکەرەوە)، مرۆڤی لە جەبریەتی دەسەڵات ڕزگار نەکرد، بەڵکو مرۆڤ ئەو حەقەی بە خۆی دا بچێتە سەر عەرشی یەزدان و لەبری ئەو بڕیار لەسەر چارەنووسی ئەم هەسارەیە بدات. بۆیە (پۆست هیومانیزم) کە جارێ خولیایەکە و هیچی تر، بڕوای بە پەیوەندی نێوان دوالیزمەکان نییە. بڕوای بە مـوژدە گەورەکانیش نییە. بڕوای بە مرۆڤێکی باڵا نییە کە پەیامی گەورەی پێبێت، چونکە مەحاڵە وێنای مرۆڤی باڵا بکەین بەبێ مرۆڤی قەزم.

(پۆست هیومانیزم) بڕوای بە مرۆڤێك هەیە، نە کۆیلە بێت و نە سەردار. ئەو پێیان ناڵێت خۆت بەو پێشی ناڵێت: خۆت مەبە، بەڵکو دەڵێت نێوەندێك بە لەنێوان خۆت و دەرەوەدا. پێی دەڵێت تۆ نە هێندە مەزنی کە بتوانیت ببیتە سەرداری گەردوون، نە هێندەش بچووك و گرگنی کە کۆیلایەتی قبوڵ بکەیت.

**شوان ئەحمەد: بەڵام ئایا سەرەڕای ئەم کێشەیەی نێوان زانست و فەلسەفە، بەدرێژایی مێژوو پەیوەندییەکی تەریب و یەکتەواوکەر لەنێوانیاندا نییە؟!**

**شاهۆ سەعید:** لەنێوان زانست وەك دەزگایەکی کەشفکردنی یاسا سروشتییەکان و فەلسەفە وەك دەزگایەکی بەرهەمهێنانی چەمك و جیهانبینی، جەنگێك لەئارادا نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەروەکو پێشتر وتم هەموو قووڵبوونەوەیەکی پەتیش لە فەلسەفەدا دەمانگەیەنێتە لۆجیکی ماتماتیك، بەڵام شەڕەکە لەوێوە دەست پێدەکات کە ئامانجی زانست لە ئامانجی مەعریفی و ڕۆشنگەرەوە، دەبێتە ئامانجێکی مەسڵەحی پەتی. واتە مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤەکاندا وەك کۆمەڵێك ژمارە، وەك چۆن مامەڵە لەگەڵ دراو و شمەکەکاندا دەکرێت. ئەگەرنا پەیوەندیی نێوان زانست و فەلسەفە پەیوەندییەکی یەکتەواوکەرە.

فەلسەفە لە ڕێگای زانستەوە هەمیشە بەجیهانبینییەکانی خۆیدا دەچێتەوە، بەرامبەر سروشت و ژیان و نهێنییەکانی گەردوون. زانستیش لە ڕێگای فەلسەفەوە هەمیشە گومان لە ئەنجامەکانی خۆی دەکات و لە هەوڵی بەدەستهێنانی ئەنجامی تازەتردایە. واتە هەمیشە زانست چاویلکەی نوێ دەبەخشێت بە فەلسەفە و فەلسەفەش هەمیشە غرووری زانست بریندار دەکات. لێرەوە من لەگەڵ هیچ ڕەخنەیەکی پەرگیردا نیم دژی زانست و ئەقلانییەت، چونکە دەبێت لە بنەڕەتدا جیاوازی لەنێوان دوو عەقڵییەتی زانستیدا بکەین: ئەقڵییەتی زانستی ئەداتی پراگماتی کە مرۆڤەکان وەك ژمارەگەلێك تەماشا دەکات (کە ئەمە دوژمنی

فەلسەفەیە)، لەگەڵ ئەقڵییەتی زانستی مەعریفی کە ئەقڵی مرۆڤی ڕوناککردووەتەوە و لە کۆیلایەتی خورافە و کۆسپە سروشتییەکان ڕزگاری کردووە (کە ئەمە هاوڕێی فەلسەفە و تەواوکەریەتی).

من لە ململانێی نێوان زانست و فەلسەفەدا (کە ئەڵبەتە ململانێیەکی پێویستە)؛ هەموو پەرگیرییەکم پێ ترسناکە. تەنانەت ئەو دژایەتیکردنەی زانست و ئەقڵانییەتیشم پێ ترسناکە کە هەندێ کەس بەناوی فەلسەفەوە ڕایانگەیاندووە، چونکە دژایەتیکردنی ڕەهای زانست خۆی لە خۆیدا دژایەتیکردنی گرنگترین بەشی فەلسەفەیە کە لۆجیکە. لۆجیك چییە جگە لە پەیڕەوکردنی یاساکانی ماتماتیك لە بیرکردنەوەدا؟

**شوان ئەحمەد: ئایا هەموو نەفیکردنێکی فەلسەفە، دواجار نابێتە مایەی گەورەکردنی ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیا لەسەر حسابی فیکر؟**

**د.شاهۆ سەعید:** بە بڕوای من دوو کەس زۆر ڕقیان لە فەلسەفەیە: یەکەمیان کەسێکە تووشی ئەقڵ جامبوون هاتووە و پێیوایە زانست و مەعریفەی مرۆیی، گەیشتوونەتە چڵەپۆپەی خۆیان و هەموو یاسا و نهێنییەکان کەشفکراون، واتە چیتر پێویست ناکات پرسیار بکەین و کێشەی مەعریفی نوێ بۆ خۆمان دروست بکەین. ئەڵبەتە ئەگەر ئەم جۆرە گوتارە تەفکیك بکەین (کە ڕۆژانە بەرگوێمان دەکەوێت)، ئەوا گوتارێکە لە ترسێکی گەورەوە سەرچاوەی گرتووە بەرامبەر تواناکانی ئەقڵ لە کرانەوە بەسەر مەودا دوورەکاندا، هەروەها بەرامبەر تواناکانی ئینسان وەك کائینێکی خاوەن ئیرادە لە دەرەوەی جەبری یاسا

سروشتییەکان. هەندێ جار هەڵگرانی ئەم گوتارە خاوەنی دیدێکی ئاینی بەرتەسکن، مرۆڤی خاوەن ئیرادە بە گوناهبارێکی گەورە دەزانن. هەمیشە حەز دەکەن بگەڕێنەوە بۆ سەردەمانی پێش دەستپێکردنی یەکەمین گوناه... واتە یەکەمین پرسیار کردن و یەکەمین سەرپێچیکردنی ئادەم و حەوا. ئەو سەردەمانەی مرۆڤ وەك ئاژەڵ لەژێر جەبرییەتی یاسا سروشتییەکاندا بوو.

هەندێ جاریش هەڵگرانی ئەم گوتارە خاوەنی دیدی ئایدیۆلۆجی دۆگمان (وەك مارکسیستە پەڕگیرەکان بۆ نموونە)، چونکە هەموو دیدێکی ئایدیۆلۆجی چەقبەستوو ئاڵتەرناتیڤێکی زەمینییە بۆ ئاینی ئاسمانی. ئەمانیش پێیانوایە هەموو یاساکان کەشفکراون، چیتر پێویست ناکات گومان لەو یاسا حەتمیانە بکەین کە جڵەوی مێژوو دەکەن، بەڵکو ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەرە خۆمان شلکەین بۆ ئەو ڕەوتی حەتیمییەتە. ئەوانەی سەر بەم خێڵەی دوژمنانی فەلسەفەن، سەر بە هەر ئایین و ئایدیۆلۆجیا و مەزهەبێکی ئاسمانی و زەمینی بن (بە یەك ئالیەت کاردەکەن)، ئەویش دامالینی ئینسانە لە قودرەتی پرسیارکردن و سەرسامبوون... بەکورتی کەسانێکن جەهل وەك دوا مەنزڵی کامەرانی و خۆشنوودی لە قەڵەم دەدەن، مەنزڵێك کە نە نیگەرانی و نەڕاڕایی و نە گومانی تێدا نییە.

بەڵام ئایا کەسی دووەم کێیە کە بوغزی بەرامبەر فەلسەفە هەیە؟ کەسی دووەم ئەو دیکتاتۆرەیە کە دەڵێت مادامەکی من شتەکان ئاسایی دەبینم، پێویستە ئێوەش بە ئاسایی بیانبینن. ئەگەر شتێکی نائاساییش

هەبوو، ئەوا من لـەبری ئێـوە پرسـیار دەکـەم و بیردەکەمــەوە و دەگەمــە ئامانج. پێمان دەڵێت هەر کاتێ وتم جەنگ و کوشـتار زەماوەنـدە، دەبێـت هەمووتان زەماوەند بگێڕن. هەر کاتێکیش وتم دۆخی ئاشـتی ئیهانەیـە و قبوڵ ناکرێت، دەبێت شاییەکانتان بگۆڕن بە ماتەم. واتە دەیەوێت پێمـان بڵێت: (ئێوە خۆتان مانوو مەکەن و بیرمەکەنەوە، من لـەبری هـەمووتان بیردەکەمەوە). ئەڵبەتە ئەگەر کەسـی یەکـەم (جـەهل) بـە دوا مـەنزڵی خۆشنوودی بزانێت، ئەوا کەسـی دووەم مـەرگ بـەو دوا مەنزڵـە ئارامــە دەبینێت.

فەلسەفە واتە سەرسامبوون بەرامبەر ئەو شتانەی کە نازانین: (ڕاستە یان درۆ؟ خێرە یان شەڕ؟). ئەنگێزەی نەزانینی یەکەم ڕاسـتە یـان درۆ؟)، ئەنگێزەیەکی مەعریفییە لەپێناو زانیندا. ئەنگێزەی نـەزانینی دووەمـیش (خێـرە یـان شـەڕ)، ئەنگێزەیـەکی ئەخلاقییـە لـەپێناو ئاسـوودەییەکی مەعریفی پەتی.

**شوان ئەحمەد: بەڵام پێتوایە فەلسەفە بتوانێت لە دەست ئایدیۆلۆژیا قوتار ببێت؟**

**شاهۆ سەعید:** لەنێوان فەلسەفە و ئایدیۆلۆجیادا، خاڵی پەیوەنـدی و خاڵی لێکترازانیش هەیـە. ئەڵبەتـە فەلسـەفە یەکێکـە لـە دەزگاکـانی بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆجیا، بەڵام ئایدیۆلۆجیایەك نا کە لە شێوەی چەند یاسایەکی ئەمر و نەهی و دوور لە قەناعەتی لۆجیکیدا بێت، بەڵکو وەك دوا جیهانبینی بەرامبەر هەڵوێستێکی دیاریکراو. ئایدیۆلۆجیایەك زادەی

فەلسەفە بێت هەمیشە لە دۆخێکی دەڵەمەییدایە، چونکە لەسەر بناغەی بڕوایەکی پێشوەخت دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر بناغەیەکی لۆجیکی دامەزراوە کە دەکرێت لە بەرامبەر هەر لۆجیکێکی بەهێزتردا هەرەسبهێنێت و خاوەنەکەشی تەسلیم ببێت.

ئەو ئایدیۆلۆجیانەی کە سەرەتا فەلسەفی بوون و دواجار چوونەتە دۆخی جامبوونەوە، هەمیشە دوای مەرگی فەیلەسوفە داڕێژەرەکانی سەریانهەڵداوە. بۆ نموونە لۆجیکی "ئەرستۆ" بە درێژایی چاخەکانی ناوەڕاست و لە جیهانی ئیسلامیشدا، وەك ئایدیۆلۆجیایەك لەلایەن گوتاری دەسەلاتدارەوە بەکارهاتووە و بۆ چەندین سەدە کەس جورئەتی ئەوەی نەکردووە ڕەخنەی بکات. تیۆری زانستی "فرانسیس بیکۆن" سەرەتا بۆ ڕەخنەی ئایدیۆلۆجیای ئەرستۆیی هاتە کایەوە، بەڵام دواتر خۆی بووە ئایدیۆلۆجیایەکی زانستی و تا ئێستاش لەسەر دەستی پراگماتی و پۆزەتیڤیزمەکان بەردەوامە. بە هەمان شێوە (دیکارتیزم و هیگڵیزم و مارکسیزم)، کە هەموویان لە بنەڕەتدا فەلسەفەی ڕەخنەیی بوون و دواتر بوونە ئایدیۆلۆجیا. هەر بۆیە فرانکفۆرتییەکان بڕوایان وایە فەلسەفە بۆ ئەوەی نەبێتە ئایدیۆلۆجیا، واتە بۆ ئەوەی لە دیدی ڕەخنەیی نێگەتیڤییەوە نەبێتە دیدی ئایدیۆلۆجی پۆزەتیڤستی، پێویستە ڕەخنە نەکاتە ئامرازێك بۆ ڕەتکردنەوەی ئایدیایەك و بنیاتنانی ئایدیایەکی نوێ، بەڵکو دەبێت خودی ڕەخنە ببێتە ئامانج. ئەگەرنا ئەو هەموو دیدێکی فەلسەفی دواتر دەبێتە دیدێکی ئایدیۆلۆجی.

بەڵام من هەست دەکەم فرانکفۆرتییەکان و هەموو ئەو کەسانەی کە ترسیان لە ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفەی ئیجابی هەیە (واتە ئەو فەلسەفەیە کە لە دۆخی دەسەڵاتدایە، نەك دۆخی ئۆپۆزسیۆن)، هەندێ جار پەرگیری لەو ترسەیاندا دەکەن، چونکە دواجار فەلسەفەش دروستکراوی ئینسانە و بۆ ئەوەی دینامییەتی مرۆڤایەتی و جووڵەی مێژووش بەردەوام بێت، پێویسە هەموو فەلسەفەیەك لە دۆخێکدا ببێتە ئایدیۆلۆجیا. نەك لەپێناو ئایدیۆلۆجیابوون، بەڵکو لەپێناو تێپەڕاندنیدا، چونکە هەرچەندە هاجیسی فەلسەفە لە هەموو زەمەن و شوێنێکدا لە یەك دەچێت، بەڵام دواجار وردەکارییەکانی هەموو تێزێکی فەلسەفی سەر بە زەمەن و سیاقی خۆیەتی. بۆیە هەڵەیە ئێمە ئیدعای فەلسەفەیەك بکەین کە بۆ هەموو کات و سەردەمێك بشێت و لە دەرەوەی زەمەن پیرۆزیی پێ ببەخشین. ڕەنگە کارێکی لەو جۆرە بۆ ئەوە بکەین کە بمانەوێت بڵێین خولیای فەلسەفی لە سەروو خولیای ئایدیۆلۆجییەوەیە، بەڵام لە حاڵەتێکی وادا خۆمان وەزیفەیەکی ئایدیۆلۆجی دەبەخشین بە فەلسەفە، نەك بە پێچەوانەوە.

بۆ ئەوەی فەلسەفە نەچێتە خانەی ئایدیۆلۆجیاوە، پێویستە خۆشنودیمان لە شێوەی مەعریفەیەکی بەچێژدا پێ ببەخشێت (نەك لە شێوەی موژدەی گەورەدا). فەلسەفە ناتوانێت وەڵامێکی ڕاست و دڵنیاکەرەوەمان بداتێ سەبارەت بەو گومانانەی دەیورووژێنێت، بەڵام دەتوانێت ئاسۆی بیرکردنەوەمان فراوان بکات و لە باڵادەستی حوکمە باوەکان ڕزگارمان بکات. بەم شێوەیە لەکاتێکدا فەلسەفە دڵنیاییمان لێدەسێنێتەوە سەبارەت بە حەقیقەتی شتەکان، غرووری ساختە و

جامبوونی ئەقڵیی ئەو کەسانەشمان لێدەسێنێتەوە کە هێشتا گەشتێکیان بە ناوچە ئازاد و ڕزگارکراوەکانی خۆیاندا نەکردووە.

جگە لەو فەزاکراوانەی کە دەکرێت فەلسەفە لە بەردەمماندا واڵای بکات، گەورەیی ئەو بابەتانەی کە هەمیشە فەلسەفە بە خەمێکی قووڵەوە لێیان ورد دەبێتەوە، بەسن بۆ ئەوەی لە بەهای ئەخلاقی و مرۆیی فەلسەفە بگەین (کە هەموو ئایدیۆلۆجیایەك ئیدعای دەکات)، ئەویش بەهای (ئازادیی مرۆڤێکە کە بیردەکاتەوە)، بەڵام ئەم بەهایە بەهایەکی فەلسەفی پەتییە، نەك ئایدیۆلۆجی، چونکە وردبوونەوەی فەلسەفی واتە دەربازبوون لەو ڕیزبەندی و دابەشبوونەی مرۆڤەکان لەناو خۆیاندا دروستیانکردووە.

کەسێك خاوەنی ئەندێشەی فەلسەفی بێت، گەردوون دابەش ناکات بەسەر دوو کامپدا: کامپی دۆستان و کامپی دوژمنانن، جوانەکان و دێزەکان، ڕەشەکان و سپییەکان، بەڵکو دەبینێت زۆرجار دیواری نێوان ئەو کامپانە وەهمین. بێگومان لای ئەویش شتێك هەیە بەناوی (بەها)وە، بەڵام بەها لای ئەو لە دۆخێکی کۆنکرێتیدا نییە. بۆ نموونە ڕەنگە قوربانیدان لە سیاقێکدا کردەیەکی ئیجابی و لە سیاقێکی تردا کردەیەکی سەلبی بێت. تووڕەبوون زۆرجار ناشرینە، بەڵام ڕەنگە هەندێ جار ڕەهەندێکی ئیستاتیکی تێدابێت. واتە سیستمی بەها فەلسەفییەکان (بەپێچەوانەی سیستمی بەها ئایدیۆلۆجییەکانەوە)، بە جیاوازی کات و شوێن و مرۆڤەکان گۆڕانکاری بەسەردادێت.

ئەو غرووره‌ی فەلسەفە پێمان دەبەخشێت زۆر بەچێژتر و گەورەترە لەو غرووره‌ی ئایدیۆلۆجیا دەمانداتێ، چونکە ئەگەر ئایدیۆلۆجیا ئینتمامان بۆ جەماعەت تازە بکاتەوە، ئەوا فەلسەفە ئینتمامان بۆ گەردوون تازە دەکاتەوە. پاشان کاتێ ئێمە لە گەردوونێکی مەزن وردەبینەوە بە هەموو جوانی و ترسناکی و ئاستە دژەکانییەوە، خودی ئەقڵ دەبێتە دەزگایەکی مەزن. هەروەك "ڕاسل"یش دەڵێت: (تا زیاتر لە لایەنگیرییە تایبەتەکانی خۆمان دووربکەوینەوە، زیاتر لە گەردوون نزیك دەبینەوە تا دۆخی ئاوێزانبوون، ئەوەش پیرۆزترین ئامانجی فەلسەفەیە).

بەڵام هەموو فەلسەفەیەکی مەزن، لە هەڵوێستێکی ساناوە دەست پێدەکات. وردتر لە ئایدیۆلۆجیایەکی دیاریکراوەوە دەست پێدەکات، چونکە هەموو لایەنگیرییەکی مەزن لە لایەنگیرییەکی بچووکەوە دەست پێدەکات... بۆیە فەلسەفە دوژمنی ئایدیۆلۆجیا و لایەنگیرییە لۆکاڵییەکان نییە، بەڵام بەمەرجێ لە جوغزی لایەنگیرییەکی گەردوونیدا بێت، چونکە مەحاڵە مرۆڤ گەردوونی بێت، ئەگەر لۆکاڵی نەبێت. هەریەکێك لە ئێمە خاوەنی فەلسەفەی خۆیەتی لە ژیاندا، بەڵام ڕەنگە ئیعلانی نەکات و نەیسەلمێنێت، چونکە هەر مرۆڤێك چەندە ئاستی بیرکردنەوەی نزم بێت، غایەتێکی لە ژیاندا هەیە کە دەکرێت ببێتە هەوێنی فەلسەفە.

هیچ مرۆڤێك ناتوانێت دەستبەرداری فەلسەفە ببێت. جیاوازییەکە ئەوەیە هەندێ کەس بە وشیارییەوە پراکتیزەی فەلسەفە دەکەن لە ژیاندا و هەندێ کەس لە نائاگاییەوە پراکتیزەی دەکەن. فەلسەفەی هەندێکیان

ترسناکە و فەلسەفەی هەندێکیان ڕۆشنگەرە. فەلسەفەی هەندێکیان ئاشکرایە و هی هەندێکیان ئاڵۆزە. فەلسەفەی هەندێکیان قووڵە و هی هەندێکیان ساویلکانەیە. ڕەنگە زۆرجار لەناو ناخی یەك مرۆڤدا ململانێ لەنێوان فەلسەفە و ئایدیۆلۆجیادا هەبێت، واتە ململانێ لەنێوان هێزی پرسیارکردن و هێزی وەڵامدانەوە، یان ململانێ لەنێوان هێزی مەعریفە و هێزی ئیعتقاد. ئیتر هەندێ جار مەعریفە دەخرێتە خزمەتی ئیعتقاد (کە ئەوە پرۆسەیەکی ئایدیۆلۆجییە)، هەندێ جاریش ئیعتقاد دەخرێتە خزمەتی مەعریفەوە (کە ئەوەش پرۆسەیەکی فەلسەفییە).

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (٢٠١٢)ی

## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەنفاکان | و. عەزیز رەئوف | شانۆنامە | ٨٣٨ |
| ٢ | ئەکرۆباتێکی ونبوو | ئیسماعیل حەمە ئەمین | وتاری رەخنەیی | ٨٣٩ |
| ٣ | پەیکی شادی | محەمەد سەعید نەجاری | شیعر | ٨٤٠ |
| ٤ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٢ |
| ٥ | خاوەن شکۆ | د. یەحیا عومەر رێشاوی | لێکۆڵنەوە | ٨٤١ |
| ٦ | ئایین و ئیستاتیکا | خەسرەو میراودەلی | لێکۆڵینەوە | ٨٤٢ |
| ٧ | کوڵێنەری هەڵم | محەمەد بەرزی | زانستی | ٨٤٣ |
| ٨ | چرایەك لەسەر مادیان کۆ | و. عەزیز گەردی | رۆمان | ٨٤٤ |
| ٩ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٣ |
| ١٠ | سایکۆلۆژیای بەهرەمەندان | عمر مەرگەیی | لێکۆڵینەوە | ٨٤٥ |
| ١١ | شوناسێکی بێنۆقرە | سەردار عەزیز | کۆمەڵە وتار | ٨٤٦ |
| ١٢ | کۆمەڵە وشە و پێکەوەهاتن | د. بێستوون حەسەن | زانستی زمان | ٨٤٧ |
| ١٣ | مێژووی چاپخانەکانی سلێمانی | مارف ناسراو | رۆژنامەوانی | ٨٤٨ |
| ١٤ | وێستگەکان | و. محەمەد کەساس | کۆمەڵە وتار | ٨٤٩ |
| ١٥ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٤ |
| ١٦ | مێژووی دێرینی کوردو شوێنەوارەکانی | کەمال نوری معروف | مێژوویی | ٨٥٠ |
| ١٧ | ئەزموونی چیرۆکنووسین | محەمەد فەریق حەسەن | وتار | ٨٥١ |
| ١٨ | پۆست مۆدێرنەو چەند بابەتێکی شانۆیی | ئەنوەر قادر ڕەشید | شانۆیی | ٨٥٢ |
| ١٩ | هەڵۆدای کوێرێك | رەنجەی نابینا | کۆمەڵەچیرۆك | ٨٥٣ |
| ٢٠ | ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو | عەلا نووری | مێژوویی | ٨٥٤ |
| ٢١ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٥ |
| ٢٢ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٦ |
| ٢٣ | سمکۆ | سەید کەمال ئیبراهیمی | مێژوویی | ٨٥٥ |
| ٢٤ | تەلیسمی گێڕانەوە | کامیل محەمەد قەرەداغی | لێکۆڵینەوە | ٨٥٦ |
| ٢٥ | نارنجی فڕین | ئەمین گەردی گلانی | چیرۆك | ٨٥٧ |

| ٢٦ | ئايين و كايە جياوازەكان | سەنگەر زرارى | كۆمەڵە ديدار | ٨٥٨ |
|---|---|---|---|---|
| ٢٧ | تيۆرە نوێيەكانى ڕەخنەى ئەدەبى | د. كەمال مەعروف | ڕەخنەى ئەدەبى | ٨٥٩ |
| ٢٨ | گۆڤارى هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٧ |
| ٢٩ | ڕەنگدانەوەى رياليزمى سيحرى | حسين سابير على | لێكۆڵينەوە | ٨٦٠ |
| ٣٠ | ميديا و دەسەڵات | و. فاروق جميل كريم | رۆژنامەوانى | ٨٦١ |
| ٣١ | ئەدەبى ئەمريكاى لاتين | و. تەها ئەحمەد رەسول | ئەدەبى | ٨٦٢ |
| ٣٢ | پلۆت لە چيرۆكى كورديدا | بوشرا كەسنەزانى | لێكۆڵينەوە | ٨٦٣ |
| ٣٣ | گۆڤارى هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٨ |
| ٣٤ | تروسكەيەك لە تاريكيدا | صلاح نيسارى | كۆمەڵە چيرۆك | ٨٦٤ |
| ٣٥ | سى و حەوت خوێندنەوەى جياواز | نەبەز تاليب | بايۆگرافى | ٨٦٥ |
| ٣٦ | سايكۆلۆژياى شۆفيرى | بەختيار محمد | زانستى دەروونناسى | ٨٦٦ |
| ٣٧ | بكوژى بابانوئێلەكان | و. مستەفا زاهيدى | كۆمەڵە چيرۆك | ٨٦٧ |
| ٣٨ | بارگە | رەفعەت مورادى | لێكۆڵينەوە | ٨٦٨ |
| ٣٩ | شێوازى شيعرى نوێ- كرمانجى ناوەڕاست | د. حمە نورى عمر كاكى | لێكۆڵينەوە | ٨٦٩ |
| ٤٠ | مادام بۆڤارى (وەرگێران) | جەبار سابير | ڕۆمان | ٨٧٠ |
| ٤١ | ڕۆمانە فارسيە هاوچەرخەكان | عمر شينكى | ڕانانى كتێب | ٨٧١ |
| ٤٢ | گۆڤارى هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٩ |
| ٤٣ | وەرزەكانى ئەيرۆبيك و دابەزينى كيش بۆ پياوان و ئافرەتان | و. ريباز ئەحمەد فرج | زانستى | ٨٧٢ |
| ٤٤ | دەقناويزان لەشيعرى نوێى كورديدا | شنۆ محەمەد محمود | ئەدەبى | ٨٧٣ |
| ٤٥ | ئەنفال تاوانێكى دژ بەمرۆڤايەتى | ستارە عارف | لێكۆلينەوە | ٨٧٤ |
| ٤٦ | تەكنيكەكانى سەردەم | جمال محەمەد ئەمين | زانستى | ٨٧٥ |
| ٤٧ | ڕەهەندەكانى شوێنكات لەدەقەوالاكانى شێركۆ بێكەس | لوقمان ڕەئوف عەلى | لێكۆڵينەوەى ئەدەبى | ٨٧٦ |
| ٤٨ | لەورديوشتە جوانەكانەوە | و. رەئوف حەسەن | كۆمەڵە چيرۆك | ٨٧٧ |
| ٤٩ | جۆرەكانى دەقناويزان لە ڕۆمانى پێنجەمين كتێب | د. نەجم ئەڵوەنى | لێكۆڵينەوەى ئەدەبى | ٨٧٨ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٥٠ | نەریت و کلتووری کوردی | م. زەکیە ڕەشید محەمەد ئەمین | کلتووری | ٨٧٩ |
| ٥١ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٠ |
| ٥٢ | شەوانی بۆن و سەفەر | فروغ نیعمەت پور | کورتەچیرۆك | ٨٨٠ |
| ٥٣ | گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا | ڕێبوار حمە تۆفیق | لیکۆڵینەوە | ٨٨١ |
| ٥٤ | پێگەی پارتە سیاسییە ئیسلامییەکانی کوردستان | فەیسەڵ سلێمان محمد | لیکۆڵینەوە | ٨٨٢ |
| ٥٥ | بنەما و پێکهاتەکانی زاراوە لەزمانی کوردیدا | شەهاب شێخ تەیب تاهیر | زمانەوانی | ٨٨٣ |
| ٥٦ | فۆرمی لۆژیك لە زمانی کوردیدا | د.کاروان عمر قادر | زمانەوانی | ٨٨٤ |
| ٥٧ | حەریق | سەید نەجمەدین عەلی محەمەد | دیوان | ٨٨٥ |
| ٥٨ | ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا | جلال محمود علی سوبحانی | فەرهەنگ | ٨٨٦ |
| ٥٩ | تەکنیکی گۆرانی وتن | و. یەدیّ شاکری (هۆگر) | لێکۆڵینەوە | ٨٨٧ |
| ٦٠ | ئێکسیری وشە | و. هادی محەمەدی | ڕەخنە | ٨٨٨ |
| ٦١ | ژنێك بۆ خۆشویستن | و. دلاوەر قەرەداغی | ڕۆمان | ٨٨٩ |
| ٦٢ | فەرهەنگی ئەڵمانی - کوردی | عەبدولکەریم عوزێری | فەرهەنگ | ٨٩٠ |
| ٦٣ | فەلسەفەی شارستانی | و. عەبدوڵلا مەحمود زەنگەنە | فەلسەفە | ٨٩١ |
| ٦٤ | لە خاچدانەوەی کریست | و. غەفور ساڵح | ڕۆمان | ٨٩٢ |
| ٦٥ | میدیا ناسی | شالاو جەعفەر | ڕۆژنامەوانی | ٨٩٣ |
| ٦٦ | دیبلۆماسیەتی کورد لە سەردەمی بوەیهیەکان | ئاراس ڕەفیق زەینەل | مێژوویی | ٨٩٤ |
| ٦٧ | شاسوارێك بەسەر پشتی باوە | و: محەمەد کەریم | ڕۆمان | ٨٩٥ |
| ٦٨ | پرسی جەستە لە یارییەکی بوونگەراییدا | عەبدولموتەڵیب عەبدوڵلا | فیکریی | ٨٩٦ |
| ٦٩ | کورتەیەك لەسەر جینۆسایدو تاوانکاری نێودەوڵەتی | ئەحمەد فەتاح محەمەد | یاسایی | ٨٩٧ |
| ٧٠ | جەلادێکی قوربانی | پشتیوان عەلی عەبدولڕەحیم | کورتە چیرۆك | ٨٩٨ |

| ٧١ | کاریگەری سەوزایی لەسەر ژینگەی شاری سلێمانی | رزگار ڕەسوڵ عەبدولڕەحمان | زانستی باخچەکان | ٨٩٩ |
|---|---|---|---|---|
| ٧٢ | نەمری و گێڕانەوە | ئارام صدیق عەبدول | لێکۆڵینەوە | ٩٠٠ |
| ٧٣ | لە پەراوێزی مەرگی شاپەروەردا | برایم محێدین عارف | کەلەپور | ٩٠١ |
| ٧٤ | ڕۆچنەیەك بۆ ئەدەبی کوردی | ئا. شەریف فەلاح | لێکۆڵینەوە | ٩٠٢ |
| ٧٥ | بۆتیقای پێکهاتەخواز | محەمەد تەرەغە | فیکری | ٩٠٣ |
| ٧٦ | ناسیۆنالیزمی کوردی و هۆکارەکانی کامڵ نەبوونی | ئازاد تۆفیق خەیات | لێکۆڵینەوە | ٩٠٤ |
| ٧٧ | شیکردنەوەیەکی جوگرافیایی بۆ سەرچاوەکانی ئاو | میقداد عەلی ئەحمەد | لێکۆڵینەوە | ٩٠٥ |
| ٧٨ | لە پێناو ئاواتەکاندا | ئیقبال سەفەری | ڕۆمان | ٩٠٦ |
| ٧٩ | شوناسی ئۆلی و فەلسەفی نەتەوەی کورد | محەمەد حیجازی | لێکۆڵینەوە | ٩٠٧ |
| ٨٠ | شتێ لە گیرفانی دایکمدایە | جەلیل کاکە وەیس | چیرۆك | ٩٠٨ |
| ٨١ | چەمکە دەروونییەکان و دەقی ئەدەبی | ناڵە حەسەن | لێکۆڵینەوە | ٩٠٩ |
| ٨٢ | پێشتربوونی دیمۆکراسی لە فەلسەفە | فاتح سەعیدی | وتار | ٩١٠ |
| ٨٣ | چنینی دەق لە شیعرەکانی (نالی)دا | ئاڤان عەلی میرزا | لێکۆڵینەوە | ٩١١ |
| ٨٤ | گفتوگۆکان | شوان ئەحمەد | دیمانە | ٩١٢ |
| ٨٥ | پریسترۆیکای بەهاری عەرەبی | ئەنوەر حسێن (بازگر) | وتار | ٩١٣ |
| ٨٦ | کلیلی ژیان | زاهیر زانا- زانست زانا | ڕۆشنبیری گشتی | ٩١٤ |
| ٨٧ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨١ |